* ناوی کتێب: کۆچ و کۆمەڵگەکانی ئایدیۆلۆژیاو کولتوور

* بابەت: لێکۆڵینەوە

* نووسینی: نەوزاد مەحمود عەلی

* تیراژ: (400) دانە

* ژمارەی سپاردن: (99) ساڵی 2002 لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر ـ هەولێر

* نەخشەسازی: هێمن سابیر

* چاپ: چاپخانەی پاک - هەولێر

سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم کە لە
بەرهەمهێنانی ئەم نامیلکەیە هاوکارییان کردووم.
بەتایبەتی هاوڕێی بەڕێز {ئەبو حیکمەت} کە
ئەرکی لەچاپدانی گرتە ئەستۆ

پێشەکی

یەکێك لەو پرسانەی کە ئێستا لە ئاستێکی فراوانەوە قسەی لەسەردەکرێ و وەك گرفتێك، "گرفتێکی کوردستانیی"، باسیدەکرێ و بانگەشەی هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئەکرێت، پرسی ((کۆچ)) و ((کۆچبەری))یە . هەڵبەت پرسێکی ناوەهاش وەك هەر حەقیقەت و حاڵەت و گرفتێکی کۆمەڵگەییتر، بە ژمارەی میتۆدە باوو کاراکانی ناو ڕۆشنبیریمان ، و بەژمارەی ئایدیۆلۆژیا ئەزموونکراوەکانی ناو مێژووی سیاسیمان، بەرونیای جیاواز و لە ڕونیای جیاوازەوە دەخوێندرێتەوە ، خوێندنەوەی : هۆکارەکانی ، ڕاگیریەکانی ، کاریگەری و ئاکامەکانی ، و چۆنایەتیەکانی بەربەستکردن و چارەسەرکردنی یان خاوکردنەوەی .

کۆچ یەکێك لە تایبەتیەکان و دەرهاویشتەکانی کۆمەڵگە ئایدیۆلۆژیەکانی ئێستەی جیهان ، یان کۆمەڵگە لۆکاڵیەکانی ئێستەی سەردەمی (( گلۆبالیزەیشن ))ە . ئەو کۆمەڵگەیانەی کە بە دەورانێکی سەرلەنوێ خۆناونووسکردنەوەی ئایدیۆلۆژیانەو مێژوونووسینەوەی ئایدیۆلۆژیانەدا گوزەردەکەن . دەورانێك کە کۆمەلگە دێنێتەوە پای ئەزموونکردنەوەو سەرگەرمبوونەوە ئایدیۆلۆژی و کولتووریەکان ، بە هەردوو دیووی پرۆسسکردنەوەی (( بە ئایدیۆلۆژیکردنەوەی کولتوور ))و ((بە کولتووریکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا)) .

ئەوەی لێرەداو بۆ پرسی (( کۆچ)) گرنگەو پێویستە هەڵوێستەی لە ئاستدا بکەین ، هەم بنەچەی ئەم دەورانە نوێیە لە ((بەئایدیۆلوژیکردنەوەی کۆمەڵگە )) و ((بە کولتووریکردنەوەی کۆمەڵگە)) ، و هەم ئەو پرسیارەشە کە ئایا کۆچ بزووتنەوەیەکی یاخی لەم دەورانەیە ، یان گوزارشت لەم دەورانەو بەرجەستەکردنێتی ؟ .

پێموایە بەبێ ساغکردنەوەی پرسیارێکی ناوەهاو بەبێ ساغکردنەوەی ((چیەتی)) کۆچ ، ستەمە ئەندێشەی ئەوە بکەین و ئاوڕ لەوە بدەینەوە کەکام لە رونیاو میتۆدە مەعریفیەکانی ناو ڕۆشنبیریمان کارایی و توانستی ئەوەی هەیە واقیعیانە کۆچ بناسێتەوە و کۆچ پێناسە بکات .و چوارچێوە ئامانژەگەریی و گوتارگەریە ئەبستراکتیەکانی تێپەڕاندبێ، و ڕێگەچارەکانی کۆچی لە خودی پرسیارەکانی کۆچ و هەوڵونستەکانی کۆچبەر، و لەو شوێنکاتە مێژوویەی کۆمەڵگەو جیهانەوە هێنابێ ، کە تیایداو بە هۆیەوە کۆچ بەرهەمدێ و سەر پێدەگەوێ .ئەم کارایی و توانینەش بە لای منەوە نە لە موقەدەسبوونی کولتووریانەی رونیاو میتۆدە کانداپە ، و نە لە باڵادەستی و دەسەڵاتڕۆیشتنی سیاسیانەی ئەم رونیاو میتۆدانە. چونکە هەر خودی کرداری کۆچ وەك حاڵەتێکی دەرەوەی چوارچێوە تەقدیسیەکان و دەسەڵاتڕۆیشتنە سیاسیەکان وەڵام بەمە ئەداتەوە . وەڵامی ئەوەی کەتاچەند ئەو رونیاو میتۆدە توانیویەتی و میکانیزمێکی نیشکردنی ئەوەی فەراهەمکردووە کە زمانێك بۆ دیالۆگکردن لەگەڵ کۆچ بدۆزێتەوە ، و کۆچ بێنێتە قەناعەتی دیالۆگکردنیی، و لەم دیالۆگردن و لێکگەیشتنەشەوە بتوانێت پرۆژەسازی ئەو دارشتنەوەیە بکات کە کۆچ لەبەردەم کۆمەڵگەی دائەنێت. لەوانەیە ساغکردنەوەی ئەو پرسیارەی سەرەوە بەرەو ئەوەمان بەرێت کە بۆ خوێندنەوەی کۆچ بە شوێن رونیایەکەوە بین ، و پرۆژە سازیەکی مەعریفیی وامان لێبخوازێت کە لە دەرەوەی هەر پێشداوەری و پێداگیریەکی کولتووری و ئایدیۆلۆژیانەوە بێت. مەعریفەیەك بێت کە ئەودیوی ئایدیۆلۆژیا یان پۆستئایدیۆلۆژیایە ! .

بە لای منەوە کۆچ پرۆژەیەکی پرسیارئامێزە . پرۆژەیەکە کە لە بەردەوامیی ڕەوتگرتنیدا نەك هەر پرسیار بەرهەمدێنێ. بەڵکو پرسیارەکان جدییتر وجەوهەریتر دەکات . تاڕادەی ئەوەی ئەم پرسیارکردنە ڕاستەوخۆ بکەوێتە نێوانی کۆمەڵگەو کۆچ . واتە

پرسیارکردنی کۆمەڵگە لە کۆچ، وپرسیارەکانی کۆچ لە کۆمەڵگە . لێرەوە دەکرێت بڵێم کە خودی ئەم نووسینە تەوەربەندی ئەم دوو دیووی پرسیارکردنەی کۆچ و کۆمەڵگە یە لەیەکتری و وەڵامەرگرتنەوەیە لەیەکتری . هەرچەندە من لەم نووسینەدا ، زۆرتر لەسەر پرسیارکردنەکانی کۆچ لە کۆمەڵگە رادەوەستم. ئەمە بەهەردوودیووی وورژاندنی کۆمەڵگە بەبێ ئارەزووەمەندنەی خۆی بۆ سەرپێکەوتنی کۆچ. یان وورژاندنی کۆچ لەلایەن کۆمەڵگەوە ، و هەروەها وورژاندنی کۆمەڵگە بەهۆی کۆچەوە کەچیدی ناتوانێت لەئاست کۆچدا بێدەربەستبێت . ئەمە چ بەواتای ناشیرینکردنی کۆچ بێت ، یان بەواتای لەئامێزگرتنەوەی کۆچبەر کە کاراکتەری سەرەکی ئەم پرۆسەیە .

هەر لەم پێشەکیەشدا دەبێت بڵێم کە ئەوەی منی هێنایە سەر قەناعەتی ئەم نووسینە چەند خاڵێکی سەرەکی بوو :

١. ئەو هەموو نووسینە زۆروبۆر و بێسەروبەریانەی لە بارەی کۆچەوە دەنووسرێنەوە . کە نەك هەر زۆر بەکەمی نەبێت لە هەر بنەچەو ئاوڕدانەوەیەکی مەعریفی بێبەشن . بەڵکو کار گەیشتۆتە ئەو رادەیە لە بچووککردنەوەی کۆچ کە بە ستوونێك و باسێکی کورتی ((خواطر)) ئاسایی بەرپرسیارێتی و شانی خۆیان لە نووسین و باسی کۆچ سووکدەکەن. و بەزۆری سەر قاڵی ووتنەوەی ووتنەکانی یەکترین . ئەو ((ووتن ))انەی نە کۆچبەرێکی هێنایە سەر قەناعەتی نامۆبووبوونەوەی سنوور ، و نەتوانیشی سوکە لەمپەرێك بێت بۆ خاوکردنەوە یان بەرگرتن لە کۆچ[1].

٢. ئەو تێڕوانینە باوەی کە بەزۆری بەئاراستەی تاوانبارکردنی ((کۆچبەر ))ن ، بەوەی پابەندیە نیشتمانی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی وکولتووریەکانی (( کوردبوون )) لە خۆی ئەتەکێنێ !و سەر زەمینێکیتر دەکاتە نیشتمان! .

## بـــەشی یـــەکــەم

**پرسیارەکانی فیمینیا کۆچ:**

١_ پێموایـە سـەرەتاییترین پرسیارەکانی لـە بـارەی کۆچـەوە دەبێـت ئەوە بێـت کـە کـۆچ گوزارشـتە لـەچی ؟، لـەچ حاڵەتێك ؟ . گـەر بـۆ خۆشـی حاڵەتێکەو دەبێت وەك حاڵەتێك قسەی لەسـەر بکـەین ، گوزارشـت لـە خـۆ کردن و گوزارشتلێکردنەکانی چین ؟.و دەبێت لە کامەی ئـەم گوزارشتانەوە لـە کـۆچ بگـەین و کـۆچ بخوێنینـەوە ؟ . بەواتایـەکیتر ، خوێندنـەوەی کـۆچ دەبێت لـەناوەوەی ئـەم پرۆسـسـە ، ئـەم دیاردەیـە ، خۆیـەوە بێـت ، یـان لەدەرەوەی . لەپێناسەی کۆچبەرەوە بێت بۆ کـۆچ ، یـان پێناسـەی کۆمەڵگـە بۆ کـۆچ . ئەمــە نەگـەرچی دواجـار و دواشـیکردنەوە هەردەبنـەوە یـەك خوێندنـەوەو یەکپێناسـە . ئـەویش ئەوکاتـەی کۆمەڵگـە دێتـە سـەر ئـەو بڕوایەی کە کۆچ و کۆچبەربوون ڕەهەندێکی کۆمەڵگەیی لـەخۆگرتووە . و دەبێت کۆمەڵگە لەبریتی پرسیارە سادەکانی لەکۆچ ، بکەوێتـە گوێگرتـن و وەڵامدانـەوە بـە پرسـیارە ئـاڵۆزو جەوهەرییـەکانی کـۆچ . ئەوکاتـەی کـە کۆمەڵگە دەبێت لەبریتی ناشیرینکردن و دزێوکردنی کۆچبەر، یان هاوشـانی ئەمـە بکەوێتــە ئامێزگرتنــەوە بــۆ کۆچبــەر . خەســڵەت و ناســینەوەکانی حاڵـەتی کـۆچ چیـە ئەمـە بەهـەردووديووی کۆچێکـی بەرجەسـتەبوو و هــەروەها کۆچێکــی نەگــەری ؟. ئایــا ئەمــە لــە تەنــها کۆمەڵگەیەکدایــەو تایبەتێتی تەنها کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی کوردستانە ؟، یـان لەمـەی تێپەڕاندووەو وەك تایبـەتێتی بەشـێکی جیـهان ، و تەنانــەت گشـتیەکی جیـهانیی و بــە ڕەهـەندێکی جیهانیـەوە ئامـادەی ئــەم تافــەی مێــژووی جیهانــە؟. ئایـا کـۆچ بـە هــەردیوێکی ئــەم تایبــەتیکردن و گشــتیکرن و ناسـینەوەیدا دەرهاویشـتەی چ گـۆڕاوی و چ وەرچەرخانێکـە ؟. گـەر ئــەم وەچەرخان وگۆڕانیە گشتگیرییەکی جیهانیـە و ئاراسـتەی شۆڕبوونەوەکانی

لە ((جیهان))ەوەیە بەرەوە ((کۆمەڵگەکان ))، و لەو دیاردە نوێگەری و نوێکردنەوەیی و نوێناکاریانەی کۆمەڵگەوە خۆی شوناسیدەکاتەوە ، و باس لە هەژموونگەری جیهانیانەی دەکات. ئایا باگراوند و ڕەهەندەکانی، کاریگەریە چاکێتی و خراپیەکانی ، گرفت و قەیرانەکانی ، ئاراستەگرتنی چین ؟. ئەمە، ئەم بنەچەو ئاراستەو ئاکامانەی لە هەموو کۆمەڵگەکاندا چوونیەکە و هەموو کۆمەڵگەکان بە بەشی وەکیەك تێیدا بەشدارن؟. یان ئەمە لە گەشەی مێژوویانەی بەشێك و دەستەیەك لە کۆمەڵگەکانی جیهانەوە هاتووە ، و دەرهاویشتەی هەڵکشانی بەرژەوەندیەکانی ئەم بەشەی جیهانە . کە دەیەوێت لە ڕێی هێزداری و توناو بەهرە زۆر و هەڵکشاوەکانیەوە ، هەموو پانتایی ئەم جیهانە بکاتە سەر زەمین و ڕەگەزەکانی فەراهەمبوون و فەراهەمکردنی بەرژەوەندیەکانی؟. گەر وەهایە ئەو ((چەمك))ە چییە کە دەتوانێت گوزارشتی پڕاوپڕ لەم وەرچەرخانە بکات ؟. ئەو مەعریفەیە چیە کە دەتوانێت ئەم گوزارشتکردنە یان مەیلی گوزارشتکردنە ڕاڤەبکات ؟. ئایا ئەمە ، ئەم مەعریفەیە ، ئەوەیە کە دەسەڵاتڕۆیشتوەکانی پای ئەم وەچەرخانە شوناسی ئەم وەرچەرخانەی پێدەکەن ! ، یان ئەمە هەمان مەعریفە پێشتر زانراوو دامەزراوەکانە ! ، یان هیچکام لەمانە نیە و ئەوەیە کە ئێستا پۆستمۆدێرنیتەکان بەهەموو فوتابخانە و تێڕوانینە جیاوازەکانیانەوە هەوڵی فۆرمۆڵەکردنی ئەدەن؟. لە حاڵێکی واشدا کە ئەم وەرچەرخانە پێدراوێکی بەشێکی جیهان و دەستەیەك لە کۆمەڵگەکانی جیهان بێت ، ئایا پەیوەندی و بەریەککەوتنی بەرژەوەندیەکان ، دیالۆگی نێوان کۆمەڵگەکان ، چ ئاراستەیەکی دەبێ و بە چ هاوکێشەیەکدا گووزەردەکات؟. خۆداڕشتنەوەی کۆمەڵگەکان ، وگوتارە گوزارشتیی و پڕۆژە سازیەکانی ئەم خۆداڕشتنەوەیە تا چەند هاوشانی کردەی ئەم وەرچەرخانە ، و تاچەند پەرچەکردەکانی ئەم وەرچەرخانە دەبن ؟. کۆچ لە کوێی ئەم

کردەو بەرجەکردنە ، لە کوێی ئەم خۆداڕشتنەوە جیاوازانە، و لە کوێی بەریەککەوتنی گوتارو پرۆژە جیاوازەکانی ئەم خۆداڕشتنەوەدایە ؟ .[٢]

دیویکیتری پرسیارەکان و بەواتایەکیتر ، ئایا درێژبوونەوەکانی پشتەوەی کۆچ تاکوێ ، کوێی کۆمەلگەیەك ، کۆمەلگەکان ، جیهان درێژ دەبێتەوە و بەتۆخی دەمێنێتەوە ؟. شۆڕبوونەوەکانی کۆچ ، ڕەهەندو کاریگەریەکانی، تاچەند لە ئێستەی هەنگاو وبڕیارە کۆمەلگەییەکاندا ئامادەیی هەیە. جا چ ئەمە بۆ ڕاگیربوون و ڕاگیرکردنەوەی دۆخی ئێستەی کۆمەلگەبن ، یان تێپەڕینی ئێستەییەکانی کۆمەلگە ؟. ئایا کۆچ تا چەند دەتوانێت و خەسلەتی ئەوەی هەیە کە بناغە و چوارچێوەیەك ، ئاماژەو ڕەنگێك و دەمووچاوێك بێت بۆ ناسینەوەی توێژێك و بەشێکی کۆمەلگە، یان کۆمەلگەیەك یان چەند کۆمەلگەیەك و تەنانەت جیهانیش ؟

٢- ئەگەر کۆچ بەدیویکدا گوزارشت بێت لە تەنکبوونەوەی سنوورە جوگرافیە دەوڵەتیەکان ، و بڕینی ئەم سنوورانە. و گوزارشت بێت لە کالبوونەوەی سێنترالیزمی دەسەلاتڕۆیشتنە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی کۆمەلگە. ئایە بە دیوەکەیتریدا گوزارشت نیە لە زەمەنی سەرلەنوێ ئەستووربوونەوەی سنوورە خوارنەتەوەییە ئەتنیی و کولتووریەکان، و تۆخبوونەوەی سێنترالیزم و پابەندیەکانی ناو ئەم سنوورانە ؟ . هەروەها ئەگەر کۆچ گوزارشت بێت لە بڕینی سنوور ، ئایا ئەمە تەنها بە مانای سنوورە جوگرافیەکانە، یان سنووریتر و پابەندیتری ناو کۆمەلگەش ؟ . گەر بەمانای دوەمیش بێت ، ئایا ئەو سنوورو پابەندیانە چین کە کۆچ دەیانبڕێ و دەچێتە ئەودیوویەوە . یان ناتوانێ بیانبڕێ و لە هەر کوێیەك بێت ئامادەو بەرجەستەیاندەکاتەوە و گوزارشتیان لێدەکات؟. یان لەبڕین و تەکاندنیان پەشیماندەبێتەوەو جارێکیتر دەکەوێتەوە بەرجەستەکردنەوەو گوزارشتلێکردنیان .

٣- کۆچبەر وەك بکەری کردەی کۆچ گوزارشتکردنەکانی لەم کردەیە، و هەڵسوڕان و چیرۆکەکانی پای ئەم گوزارشتکرنەی لە کوێی

گۆڕاوییەكانی ژیانەوە دەهێنێ ؟ . ئایا ئەم گوزارشتكردنەی ئیرادەگەرییە ، یان ئیرادەداگیرگراو و لە دەرەوە ئاراستەكراو ؟. گەر ئیرادەگەرییە ئەو هۆشیارییە چییە كە كۆچ بەرهەمدێنێ ؟. گەر نێگەتیڤبوونی ئیرادەشێتی ، ئەوە چ هێزێكە كە كەسێك بێئیرادەییانە دێنێتە پای كەلكەڵەو بڕیارو قەناعەتی كۆچ و كۆچبەریبوون ؟. بەواتایەكیتر پۆزەتیڤبوونی ئەم هێزە چ خەسڵەتێك و ئاراستەیەكی هەیە ، دەرپەڕاندن – لەناو كۆمەڵگەوە – یان ڕاكێشان – لە دەرەوەی كۆمەڵگەوە – یان هەردووكیان ؟. ئایا ڕاگیركردنی كۆچ وئەم پۆزەتیڤبوونە لەسەر هەر كام لەم دیوانە بەواتای خوێندنەوەو ڕاڤەكردنی جیاوازی كۆچ نیە لەوانیتر ، لە ئاراستەكانیتر ؟.

4- ئایا لە نێوان كۆچ و نامۆییبووندا پەیوەندییەك هەیە ؟ گەر ئا، لەم پەیوەندییەدا كامیان گوزارشتن لەویتر و كامیان ئاماژەن بۆ ئەویتر ؟ بەواتایەكیتر، ئایا كۆچ گوزارشتە لە نامۆییبوونێك، یان بۆ خۆی فۆرمێكیترە لە نامۆییبوون، یان كردەیەكە بەرەو نامۆییبوون ؟ ئەمە نامۆییبوونە لەچیو نامۆییبوونی كێیە ؟ نامووییبوونی تاكی كۆمەڵگە یان نامۆییبوونی كۆمەڵگەیەك ؟. گەر بەراستی ئەمە نامۆییبوونی كۆمەڵگەیە ئایا كۆمەڵگەی كوردستان لەبەردەم چ نامۆییبوونێكدایە، نامۆییبوون لە مێژووی خۆی ، لە كولتووری خۆی، یان لە ئێستەی نەتوانینی داڕشتنەوەی سەردەمیانەی سستمی گشتی كۆمەڵایەتیانەی ؟. گەر ئەم نامۆییبوونەش پرسی تاكی كوردستانییە ، ئایا سەرچاوەكانی ئەم نامۆییبوونەی چییە ، و لە كوێوە دێن ؟. لە دەسەڵاتی سیاسیەوە یان لە ئایدیولۆژیا یان لە كولتوور یان لەو داچڵەكینە مێژووییانەی ئەنفال و ڕاپەڕین و كۆڕەو و شەری ناوخۆ، یان لە یەكێك لەو داچڵەكینانەوە ؟. بەواتایەكیتر ، تا چەند كۆمەڵگەی كوردستان لەنامۆییبوونی ڕۆڵەكانی بەرپرسیارە ، و گشتیی ئەم نامۆییبوونەی ئەستۆگیردەبێت؟. هاوشانی هەموو ئەمانە ئایا نامۆییبوون وەك دیوێكی پەراوێزبوون ڕەهەندێكی جیهانیانەی نیە ؟. لێرەوە، ئەی بۆچی پەرچەكردەی كۆمەڵگەكانیتر – ئەو كۆمەڵگەیانەی كۆچی بۆ

دەکرێ– دژی کـۆچ و کۆچبـەر وەهـا شوناسـینەکرێت کـە فۆرمێکـە لـە نامۆبیبوونی تاکی ئەو کۆمەڵگەیانەش؟.[٢] بەواتایەکیتر ، ئایا کۆچ بۆخۆی پرۆسێکی سەرپێکەوتنی نامۆبیبوون و پەرواێزبوون نیە. چ بەودیوەدا کە کـۆچ سـەرپێندەخات و چ بـەو دیوەشـدا کـە دژی دەوەسـتێ ، چ لـەو کۆمەڵگەیـەی کۆچی لێدەکرێ و چ لـەو کۆمەڵگەیەشـدا کـە کۆچی بـۆ دەکرێ؟.

د- ئەگـەر نـامۆبیبوون دۆڕاندنـی ئینتمـاو تـەکاندنی شـوناس و وونبوونـی پێوانـە بەهاییـەکان و لێڵبوونـی ئاراسـتەکان و نەناسـینەوەی شەپۆلەکان و تێکەڵکردنی رەنگەکان بێـت. ئەگـەر نـامۆبیبوون تـرازان و لەگرێژەنـەچوونی هاوسـەنگیەکان وشـلبوونەوەو لـە هـەندێك حاڵەتیشـدا هەڵتەکێنی ئەو رێساو چوارچێوە و لێکلیگەیشتنانە بێت کـە بیروبـاوەڕێکی پێکەوەیی وتێروانینی بەرەو ئایندەیی پێکەوەیی و ئیشکردنێکی پێکەوەیی کۆمەڵگەییانـە فەراهەمدەکـەن. ئـەوا هاوشـانیبوونی کۆمەڵایـەتی و کۆمەڵگەیی وەمەعریفیانەی نامۆبیبوون پەراوێزبوونـە. پـەراوێزبوونی تـاك لە کۆمەڵگە، وپەرواێزبوونی کۆمەڵگەیەك لە جیهان. لێرەوە دەکرێـت ئـەو پرسیارە بکەین، ئایا کۆچ گوزارشتێکی تـاکی بـە پەرواێزبووی کۆمەڵگە، و بەرهـەمی کۆمەڵگە بەپـەراوێزبووەکانی جیهان نیە ؟. لەمەشـەوە کـۆچ تـا چەند دەتوانێت تـاك لـە پـەرواێزبوون رزگـار بکـات ؟. ئایا کـۆچ ئـەو کـردە پۆزەتیفـە زەروورییەیـە کـە لێـوەی پرۆسـەکانی خودناسـینەوەو خوددۆزینەوەو خودپێناسەکردن و خودسەلماندنەوەی تـاکی بـە پـەراوێزبوو فەراهەمدەکات ؟. ئایا ئـەم فەراهەمکردنـە تـا چـەند لـە پێکهاتـەیدا لـە ئاراسـتە گرتنیـدا یۆتۆپیـاو واقیعیبـوون بەشـدارن ؟، و تـا چـەند لـە بەرجەستەبوونیدا یۆتۆپیاو واقیعیبوون ئامادەن ؟.

ئەگەر کۆچ بەرهەمی کۆمەڵگە بەپەراوێزبووەکان و پرۆژەو کردەی تـاکی بەپـەراوێزبووە ورەوتگرتنـی بـۆ تێپـەڕینی نـامۆبیبوون و بەپەراوێزبوونە. ئایـا ئەمـە ئیـتر تاکەکەناڵ و تاکە دەرچـەو تاکەشێوازو

تاکەفۆرمی ئەم تێپەڕینەیە ؟ یان ئەم تێپەڕینە لە کەناڵێترو بە شێوازو فۆرمێتریشدا گوزەردەکات؟. گەر وەڵام ئەمەی دواییە ئەوا دەکرێ ناسینەوەو وێناکردنێکیتریش بۆ کۆچ بکەین کە بەرجەستەبوون و گوزارشتلێکردنەکانی تەنها سەفەرکردنی بۆ ئەو دیووی سنورەکانی نیشتمان نیە ! . هەرچەندە ئەمەیان لەدەرەوەی ئەم بەسەو پێچەوانە یان دیوێکیتری ناسینەوەی باوی کۆچە.

دیوێکیتری پرسیارەکە : ئەگەر حاڵەتەکانی نامۆییبوون و پەراوێزبوون وەهابێت کە بەدیوێکیدا کۆمەڵگەکان بەجیاو لە دەرەوەی ڕێساو پەیڕەوە سەردەمیەکان بکەونە مێژوونووسینەوەی خۆیان . و لە لارێگە مێژووییەکانەوە پرسی خۆدارشتنەوەو خۆشوناسیکردنەوەیان تاقیبکەنەوە و بەرجەستەبکەن . ئایا کۆچیش یەکێك لەو لارێگە مێژووییانە نیە لەسەر ئاستی تاکی کۆمەڵگە ؟. ئایا حەقیقەتی لارێگە مێژووییەکان تێپەڕینی قەیران و گرفت ، تێپەڕینی نامۆییبوون و پەراوێزبوونە ، یان قوڵترکردنەوەیان ؟.

٦- لەوێوە کە بەشێکی ئێجگار کەمی ئەوانەی کۆچدەکەن دەگەنە ئەو ئومێدو خەونانەی لە گرەوی کۆچیان ناوە . لەو بێئومێدبوونەی ئەو بەشە زۆرەی کۆچبەر ، دەکرێت پرسیاری ئەوە بکەین ، کە کۆچ و یۆتۆپیا چ ئاوێنەکردنەوەیەکیان بۆ یەکتری هەیە ؟. و لەمەوە ئایا کۆچ چ پێناسەکردنێك هەڵدەگرێ و ناسینەوەکانی بەکام دیوەدا دەبێت . بەوەی کە کۆچ کردەو پرۆژەیەکی یۆتۆپیە یان گوزارشتە لە یۆتۆپیایەك ، یان یاخیبوونە لە یۆتۆپیایەك ؟. بە واتایەکیتر ، لە نێوان کردەو بەرجەمکردە یۆتۆپی و واقیعیەکاندا کۆچ چ مەوقیعێکی هەیە ؟. پێموایە لە هەموو ئەم حاڵەتانەو بەهەموو گریمانەکانی بەم یان بەو دیوەدا شکاندنەوەی ناسینەوەی کۆچ ، دەبێت شۆڕبوونەوەی خوێندنەوەکانمان لە (جیهان)ەوە بەرەو کۆمەڵگەکان و ئەمجا لە کۆمەڵگەکانەوە بەرەو کۆچ بێت . و ئەو پرسیارە بکەین ، کە سەردەرهێنانەوەی یۆتۆپیا لە کوێی گۆڕاویە جیهانیی

و کۆمەڵگەیەکاندایە ؟. گەر دەمانەوێت وەڵام لە جیهانەوە وەرگرین ، ئایا دەموچاوەکانی یۆتۆپیا چین ؟ئەگەر کۆچ ڕەنگێکی یۆتۆپیای کۆمەڵگەکانی ئێمەیە ، ئەی ڕەنگە یۆتۆپیاکان ئەو کۆمەڵگەیانیە چیە کە کۆچیان بۆ دەکرێت ؟. و ڕەنگەکانیتری یۆتۆپیای کۆمەڵگەکانی خۆشمان چین ؟. هەر لە درێژکردنەوەی ئەم پرسیارەوە دەکرێ بە شوێن جۆنایەتی ئەو پەیوەندیەوە بین کە لە نێوان کۆمەڵگەکانی ئێمەو یۆتۆپیادا هەیە !. و پرسیاری ئەوەبکەین کە ستراکتووری ئەم پەیوەندیە قەدەرییە، یان بڕیاری خۆمان و هەڵبژاردنی خۆمانە ؟. گەر قەدەرییە ئەمە قەدەریبوونی چ حەتمیەتێکە ، حەتمیەتی ڕەبردوومان یان حەتمیەتی ئێستەی بەشمان لە جیهان ؟. گەر ئەم یۆتۆپیایەش لە هەڵبژاردن و بڕیاری خۆماندایە ، پشتەوەی ئەم هەڵبژاردن و بڕیارە چیە ؟. ئەو گوتار و پرۆژانە چین ، ئەوانە کێن کە کۆمەڵگە بەرەو یۆتۆپیابوون ڕاپێچ و ئاراستەدەکەن ؟. وەڵامدانەوەکانی تا ئێستای کۆمەڵگە لە بەرامبەر ئەم هەوڵی یۆتۆپیاکردنەیدا تا چەند کاراو پۆزەتیڤ، و تا چەند سست و نێگەتیڤ بووە ؟. ئیشکالیەتەکانی ئەم وەڵامدانەوەیە لە چیدایە؛ لە کەسەکان یان لە میتۆدو رونیا یان لە میکانیزمەکانی ئەم وەڵامدانەوەیە؟. ئایا تێپەڕاندنی یۆتۆپیابوون تا چەند لە توانای ئێستەی کۆمەڵگەکاندایە؟. و کێن ئەوانەی ئەم توانایەیان هەیە؟. و میکانیزم و کەرەستەکانی ئەم توانینە چین ، و لەکوێوەو لە چییەوە دەرسکێن ؟.

٧- لە وێوە کە هەموو سڕینەوە و ترازانی پنتێك ڕەنگرێژییە بۆ پنتێکیتر. وهەموو تەکاندنی شوناسێك خۆشوناسیکردنەوەیەکیترە . و هەموو کاڵبوونەوەو دۆڕاندنی ئینتمایەك تۆخبوونەوەو دۆزینەوەی ئینتمایەکیترە . لەمانەوەو کە ئێستا زۆر باسی ڕاگیربوونەوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و پەیوەندیەکانی نێوان کۆمەڵگە ودەوڵەتەکان لەسەر پنتێکی نوێ. وباسی قەیرانی شوناس و ڕەهەندی جیهانیانەی ئەم قەیرانە وباسی سەختی وبەجەنگ و ململانێی توندی تا رادەی پاکتاوکردنی

رەگـــەزی و ژینۆســـایدکردنی ڕەگـــەزیدا گوزەرکردنـــی پرۆســـەکانی خۆشوناســـیکردنەوە. و باســـی شمولیبـــوون و گـــەردوونیبوونی ئینتمـــاو هـــەروەها بچوکبوونـــەوە و کورتبوونـــەوە ولۆکـــاڵیبوونی ئینتیمـــادەکرێت . لەمانەوە ئایە کۆچ چ ئاوێنەکردنەوەیەکی بۆ ئینتما هەیە ؟. ئایا دەکرێت کـــۆچ وەك پرۆســـێکی کاڵبوونـــەوە و کاڵکردنـــەوەی چ ئینتمایـــەك، و تۆخبوونـــەوەو تۆخکردنـــەوەی چ ئینتمایـــەك شوناسیبکەین ؟ گـەر نـا، ئایـا کۆچ لە زەمەنی کاڵبوونەوە یان تۆخبوونەوەی چ ئینتمایەکدا هاتووە. و لـە سەرپێکەووتنیشیدا چ ئینتمایەك کاڵدەکاتـەوە یـان تۆخدەکاتـەوە؟. کـەباس لە ئینتما دەکەین، ئەی پێناسـەمان بۆئینتمـا چیـە؟سنوورەکانی ئینتمـا تـا کوێ بڕنـەکاو لـە کوێـدا کۆتـاییدێت ؟. کێـن ئەوانـەی، چـین ئـەو شـتانەی ڕەنگرێژی ئینتماکانیـان کـردووەو دەیکـەن ؟. ئـەو کـردەو ڕەفتارانـە، ئـەو قسەو گوزارشتانە چین کە کەسێك لە ئینتمابووندا دەهێڵنەوە و کەسێکیش فڕێ ئەدەنـە ئـەو دیـووی چوارچێوەکـانی ئینتمـا ؟. ئایـا ئینتماکـان وەك ئـەوەی هـەن، وەك ئـەوەی بۆمـان داڕێــژراوە و تیـایدا ئالیەتمـەندکراوین و لـەکولتوورو یادەوەریـــەکانماندا نشـــێنراوە. و وەك ئـــەوەش کـــە خۆمـــان دامانڕشتوون و خۆمان پێتایبەتمەندکردووە، هەر ئەو ڕافەکردنانـەی هەیـە کـە مەعریفـەی داڕێـژەر وێنـاکردووە ورەسمیکـردووە ؟. و درێژبوونـەوە وپەرژینـەکانی وەهـان کـە ئـەتوانرێت دەخالـەتی تێدابکـرێ ؟، یـان بـە شـێوەیەکی ڕێـــژەداری ئامـــادەی مێـــژووە جیاوازەکانـــە؟، ولەمەشـــەوە خوێندنـــەوەی فرەوجیـــاواز هـــەڵدەگرێ ؟. ســـەرەڕای ئەمـــەش ، لـــەو حەقیەقەتەشـەوە کـە کۆمەڵگـەکان لـە شـەفافیبوونی پێشـمۆدێرنیتەییان تێپەڕاندووە و بـەڕووی یـەکتریدا کـراوەن . و لـەناویاندا بەرژەوەندیـەکان وجیاوازیـەکان لـە رسـکانی بـەردەوام و بەریەککـەوتنی بـەردەوامدان. ئایـا لەمەشـەوە وێنـاکردن وخوێندنـەوەی ئینتماکان جیاوازنـابن ؟. ئەگـەر بـە شێوەیەکیتر ئـەم پرسیارانە بکەین، ئایا ئینتماکان هـەر ئـەو وێنـە و ئـەو ڕووەو ئـەو دیـوەی هەیـە کـە مەعریفـە دەسەڵاتڕۆیشـتووەکانی ئـاو

رۆشنبیریمان وێناو رەسمیەکەن، یان وێنە و رووبەرو دیوویتریش ؟. لێرەوە، لەم تێروانینە ڕێژەداریکردن و مێژوویکردن و کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەییکردنەوەیە جیاوازیەکان دەرسکێن و سەردەکەون و زەقدەبنەوە. وچاویتری جیابینین و روانگەیتری بینین و ئەندیشەکردنیتری جیاوێناکردن دەرکدەکرێ. ئەی بۆچی لەم تێروانینەوە پێناسەکردنی کۆچ ئەوە نەبێت کە پرۆژەیتری بینینە جیالەوەی لێراهاتووین و بەسادەیی و بێگرێوگۆڵ شتەکانی پێدەناسینەوە . و بەمەش گوزارشتکردن بێت لە وێناو روو و دیووی جیاوازی ئێنتما ؟!.گەر وەها نیە، ئەی بۆچی تا ئێستا لەگەڵ زۆری قسەکردنەکانمان و زۆری پێداگریەکانمان بۆ ئینتماکان و زۆری پیاهەڵدان و شانازیەکانمان بە ئینتماکان وزۆری ((هوشیاریدان))ەکانمان بە کۆچبەر بۆ شوناس و بۆ ئینتما ، کۆچ هەر بەردەوامە. نهێنی ئەم بەردەوامیە لە چیدایە ؟. ئایا ئەمە لەو تێروانینە شمولییە کولتووری و ئایدیۆلۆژیەوە نیە کە وەها وێنای بینینەکان دەکات کە هەردەبێت لە چاوەکان و بینینەکانی ئەوەوە بێت !. وەها وێنای گوزارشتەکان ، ئاماژە و قسەکان دەکات کە هەردەبێت لە تێروانینەکانی ئەوەوە بێت !، وەها پرۆژەسازیکردن و ئیشکردنە مێژوویەکان هەڵدەسەنگێنێ کە جگە لەوەی خۆی ، لە پرۆژەو ئیشکردنی خۆی حەقیقەت ودۆزینەوەی حەقیقەت لە هیچکامیاندا نەك هەر نابینێ بەڵکو نڕێشی دەوەستێ و ئەفیشیەکاتەوە ؟!. ئایا ئەمە مانای ئەوە نیە ، بەدەرخەری ئەو حەقیقەتە نیە کە راڤەکردن و خوێندنەوەی کۆچ لەدەرەوەی توانای گەرسە مەعریفیە ئایدیۆلۆژی و کولتووریەکانە ؟. مانای ئەوە نیە کە کۆچ تێپەڕین و بڕینی چوارچێوەو دیوارە سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیەکانی ئایدیۆلۆژیاو کولتووره ، و خۆناونووسکردنەوەو خۆشوناسیکردنەوەی کۆچبەرە لەفەزایەکی دەرەوەی لۆژیك و فەزا رەقەنەکانی ئایدیۆلۆژیاو کولتوورەوە ؟ . فەزایەك ، کە نەئایدیۆلۆژیاو نە

کولتوور توانای وێناکردن و مەیلی وێناکردن و توانای خوێندنەوەو مەیلی خوێندنەوەی ئەو فەزایەیان نییەو ناتوانن لێیبگەن و تێیبگەن ؟!.[1]

بۆ روونکردنەوەی ئەمە، روونکردنەوەی رێژە داریبوون و گۆڕاوی وجیاوازی گوزارشتکردنەکان لە ئینتما، با هەلوێستەیەك لە ئاست دوو چەمکی نیشتمان و ئازادیدا بکەین. کەوەك ئینتمابوون وێناکراون !

ئەگەر کۆچ ئەو راڤەکردنە بێت کە بڕینی سنوری نیشتمان و پشتکردنە نیشتمان و تەکاندنی نیشتمانپەروەریبوونە . و کۆچبەریش ئەو کەسە بێت کە بکەری ئەم بڕین و بەزاندنی سنوورەو پشتێکردن و تەکاندنەیە . ئایا سنووری نیشتمان تەنها ئەم دیووە جوگرافیەی هەیە؟. و ئینتمابوون بە نیشتمان و نیشتمانپەروەریبوون تەنها ئەم هێما و دەلالەتە جوگرافیەی هەیە ؟. ئەمە، ئەم جۆرە راڤەکردنە بەهیچ ئیشکالیەتێك بارگاوینیە ؟. بەلای منەوە و لە ئێستەدا و بۆ پرسی کۆچ ئەم ئینتمابوونە بارگاویە بە جۆرەها پرسیار و جدیترین ئیشکالیاتی تێنەگەیشتنی لە خۆیدا هەلگرتووە. وسادەترین شێوەی باسکردنی ئەمەش لەوەوەیە کە دەشێت کەسێك سنووری جوگرافی نیشتمانیشی نەبەزاندبێ وکۆچیشی نەکردبێ وەلێ ئینتمابوونی بە نیشتمانەوە هێندە کالکردبێتەوە تا رادەی لە خۆتەکاندن. وکەسێکیش ئەم سنوورەشی بەزاندبێ و ئینتمابوونی بە نیشتمانەوە نە دۆراندبێ. و نیشتمانپەروەرێتی لە ئیدیالترین و موقەدەسترین شێوەیدا بەرجەستەبکات . و لانیکەم تارادەی کەسانێکی ناوەوەی نیشتمان ، نیشتمانی خۆشبوێت و نیشتمانپەروەری وەك پابەندییەك وێنابکات .

زۆرن ئەوانەی بەسەرسوڕمانەوە ئەوە ئەلێنەوە و وەلامی ئەوەیان پێنادرێتەوە، کە بۆچی جاران بۆ ئازادی تێدەکۆشاین و لە پێناویدا قوربانیمان بەخۆمان ئەدا ، کەچی ئێستا دوای دەستەبەربوونی ئازادی ، کۆچ لە ئازادی دەکرێ !؟ ئەو گۆڕاویە چیە کە دوو ئەوەی کۆمەلگەیەك لەیەکتر ئەترازێنێ: ئەوەیەك بۆ ئازادی قوربانی ئەداو ئەوەیەکیش کۆچ

لە ئازادی ئەکات ؟!. ئەینی ئەمە لە چیدایە؟. تۆ بڵێی ئەوەی ئەوەی پێشوو قوربانی لە پێناویدا ئەدا وەهم و ئەندێشەی ئازادی بووبێ !. و ئەوەی دەستەبەریشبووە ئەم وەهم و ئەندێشەیە بێت ؟!. پێموایە گرێی ئەم سەرسوڕمان و بێوەلامیبوونە نەلە ئەوەکانداییەو نە لە ئازادیدا . بەڵکو لەو مەعریفەیەدایە کە ئازادی پێدەخوێنینەوە، و بەهۆیەوە گوزارشت لەم چەمکە دەکەین . کە وێناکردن و تێڕوانینەکانی بۆ ئازادی وەهایە کە ئینتما و چوارچێوەیەکە نابێت ببەزێنرێ و پشتیتێبکرێت !. ئایا بەم تێڕوانینە، چەمکی ئازادی و گوزارشتکردنەکان لەم چەمکە وەها ناکەونەوە ، کە خودی ئەم چەمکە بکرێتە میکانیزمێك بۆ کۆتکردن و تێرۆرکردنی ئازادی ؟. ئایا ئەمە ترازانتن و هەڵگەڕانەوەی ئازادی نیە لە حەقیقەتی خۆی ، لەوەی فەزایەکی فراوانە بۆ سەربەستبوون ؟. بە واتایەکیتر ، ئایا دەستەبەربوونی ئازادی بۆ خۆ داخستنە یان کرانەوە ؟. لێرەوە ئەی بۆچی پێناسەکردنێکی کۆچ ئەوە نەبێت کە گوزارشت و بەرجەستەکرنێکی پڕاوپڕی ئەو ئازادیە بە کە ئەوەی پێشوو قوربانی لە پێناویدا دا.[5]

٨- لەوێوە کە ئێستا زۆر باسی قەیرانی شووناس و سەختی پرسی خۆشووناسیکردنەوە ودۆزینەوەی شوناس دەکرێت. ئایا هەربەڕاستی زەمەنی ئێستا زەمەنی قەیرانی شوناس ، زەمەنی تەکاندن و دۆڕاندن وزەمەنی وورووژاندن ودۆزینەوەو زەقکردنەوە و بەرامبەروەستانی شوناسەکانە ؟. ئەو شوناسانە چین کە کاڵدەبنەوەو دەدۆڕێن، یان تۆخدەبنەوە و ئامادە و بەرجەستەدەکرێنەوە و دەدۆزرێنەوە؟ ئایا ئەمە، ئەم پرسی شووناسە هەر بازنەگیریی شوناسە زانراوەکانە، یان تێپەڕێنێك لەمەدا هەیە ؟ ئەگەر وەلام بازنەگیرکردنەوەی شوونانسە زانراوە کۆنەکانە، ئایا ئەم شووناسانە بەهەمان فۆرم و گوزارشتکردنە پێشوونەکانیانەوە ئامادەدەبنەوە و دەبێت ئامادەبکرێنەوە، بێلاکردنەوە لە گۆڕاویەکانی ژیان ؟. ئایا ئێستەی گۆڕاویەکانی جیهان بەو ڕادە بونیادی و جومگەییەیە کە

شوناسێکی نوێی لێوه بەرهەمبێت ؟. گەر وەهایە ئەم شوناسە نوێیە، فۆرم و ناسینەوە و خەسڵەتەکانی، گوزارشت لەخۆکردن وئامادەبوون، و گوزارشتلێکردن و ئامادەکردنەوەکانی چین ؟.لەمەوە ئایا کۆچ وەك دیاردەیەکی ئەم زەمەنە چ ئاوێنەکردنەوە یان رایەڵبەندییەکی بەپرسی شووناسەوە هەیە ؟. وئایا دەتوانێت گوزارشت و پرۆسێسێك بێت بۆ تەکاندن یان بەرجەستەکردنەوەی ئەم یان ئەو شووناسە ؟. ساغکردنەوەی ئەم پرسیارە لای من گەڕانەوەیەکی زەرووری دەوێ بۆ پرس و چەمکەکانی نامۆییبوون و پەراوێزبوون و ئینتمابوون . هەروەك گەڕانەوەیەکی دەوێت بۆ تەواوی شوناسەکان ، هەر لە شوناسە سەرەکی و کۆگیرە گەورەکانەوە "ئاین ، نەتەوە ، نیشتمان" تا دەگات بە لکەشوناسییەکانی ئەم شوناسە کۆگیرە وەك "حزب ، خێڵ ، خێزان ... هتاد" .

٩- تا ئێستا لای ئێمە وەها کۆچ لێکدەدرێتەوە کە دیاردەیەکی خراپ و گرفتێکە دەبێت چارەسەر بکرێت !. نەخۆشیەکە دەبێت دەرمانبکرێت !، دیاردەیەکە ئەگەر حەکیمانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت گەر بنەبڕیش نەبێت، خاوودەبێتەوە !! . لێرەوە ئایا چارەسەرکردنی پرسی کۆچ بە چ پرۆژە سازیەك و چ ئیجرائاتێك دەبێت ؟.

کێن ئەوانەی دەتوانن پرۆژە سازیەکی ئاوەها بکەن: سیاسەتمەدارەکان یان پیاوانی ئایدیولۆژیا یان پیاوانی ئاینیی، یان کێ ؟! ساغکردنەوەی پرسیارێکی ئاوەهاش بەرەو ئەوەمان دەبات کە بپرسین پرسیارەکانی کۆچ لەکێ و لە چییە؟. کۆچ لە بەرامبەر چیدا سەرپێکەوەتووە؟.

## بەشی دووەم

بەر لە ساغکردنەوەی ئەم پرسیارانە ، و پرسیارگەلیتری لەم چەشنە کە بۆ تێگەیشتن لە ((چیەتی)) کۆچ دێنەپێشەوەی هەر باس و قسەکردنێکی دەربارەی کۆچ. و بۆ ئاسانی ئەم ساغکردنەوەیەش، پێویستە ئاورێك لەو نەریتە شیکاریە و لەو تێز و فۆرمی خوێندنەوەیە بدەینەوە کە تا ئێستاش لە زوربەی گووتارو پرۆژەو میکانیزمەکانی ئیشکردنی سیاسی و حزبی و ئایدیۆلۆژی وڕۆشنبیریەکانماندا – ئاڵێم مەعریفی – بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنی حاڵەتە کۆمەڵگەییەکان بە دەستەوە دەگیرێ . ئەویش ئەوەیە کە:

١- یان ئەم تێگەیشتنە بە تەواوەتی وبە تەنها پابەندی خودی ئەو دیاردەیە دەکرێ. و بۆ ئیشلەسەرکردنەو ئیشتیاکردنی ئەو دیاردەیە ، جا ج ئەمە بەو دیوەدا بێت کە وەها لەو دیاردەیە بڕوانرێ کە دیاردەیەکی باشە، و دەبێت ڕاگیریەکانی پتەوتر وبەرجەستەبوونەکانی بەرینتر و تەوزیفبوون وتەوزیفکردنەکانی کاریگەرتربن . یان بەو دیوەدا بێت کە ئەمە دیاردەیەکی خراپە، و دەبێت چارسەری بۆ بدۆزرێتەوە. و دەبێت بۆ کورتپێهێنانی کاریگەریەکانیی هەوڵی بچوککردنەوەی بازنەی کۆمەڵایەتیانەی پراکتیزە وبەرجەستەکردنەکانی بدرێ. ودواجاریش وەها بکەونەوە کە کۆمەڵگە بتوانێت تێپەڕیانکات و جزیانکات. ئەڵێم بۆ ئەم ئیشلەسەرکردنەو ئیشتیاکردنەی ئەو دیاردەیە، و خوێندنەوەی ئەو دیاردەیە تەنها ئەوە دەکرێتە بناغەو مەحەك کە ئەو دیاردەیە لە بارەی خۆیەوە چی دەڵێت، چۆن گوزارشت لە خۆی دەکاتا. تەنها پشت ئەدرێتە ئەو دینامیکیەت و رونیا ومیتۆد و میکانیزم و (( مفردات))انەی کە خودی ئەو دیاردەیە بۆ ڕاڤەکردنی خۆی، بۆ ناسینەوەو شوناسیکردنی خۆی، بۆ ڕاگیرکردنی خۆی و خۆبەرهەمهێنانەوەی، بۆ وێناکردنی خۆی لەناو خۆیدا

و ئاوێنەکردنەوەی ئەم وێناکردنەی بۆ دەرەوەی خۆی، بە دەستیەوە دەگرێ. نموونەکانی ئەم جۆرە تێگەیشتنەش: وەك ئەوەی تەنها لە تێڕوانین و لە قسەکانی کولتوورگەرێکەوە کولتوور بخوێنینەوە. و لە قسەکانی ناسیونالیستیکەوە ناسیونالیزمی، و لە قسەکانی نیکۆنۆمیست و تەکنوکراتیکەوە گلوبالیزمیشن، ولەقسەکانی کۆمۆنیستیکەوە سستەمی سۆڤیتی جاران، و دواجاریش لە تێڕوانین و لە قسەکانی کۆچبەرەوە کۆچ بخوێنینەوە !!.

٢- یان ئەم تێگەیشتنە بە تەواوەتی لە هەر ڕیەڵبەندی و شۆڕبوونەوەیەك بۆ ناو ئەو دیاردەیە. لە هەر هەڵویستەکردن و ڕاوەستانێك لەناو خودی دیاردەکەوە، دەپچڕێنێ !. وبێگوێگرتن لەوەی ئەم دیاردەیە لەبارەی خۆیەوە چی دەڵێت و چۆن گوزارشت لە خۆیدەکات ـ یان بە کردەیەکی لە بێژنگدانی قسەکانی ئەم دیاردەیە لە بارەی خۆیەوە، بە زەقکردنەوەی هەندێکیان و چزکردنی هەندێکیان بەپێی ئامانجەکانی ئەم خوێندنەوەیە ــ، و بێلاکردنەوە لە گوزارشتە کۆمەلایەتی و کۆمەلگەییەکانی ئەو دیاردەیە. بێبینیی تایبەتمەندێتیەکانی ئەو دیاردەیە، و ڕادەو پانتایی بەرچەستەبوون و گوزارشتکردنی کۆمەلایەتی و کۆمەلگەییانە لەو دیاردەیە، بێ هەموو ئەمانە دەکەوێتە خوێندنەوەی دیاردەکە !!. نموونەی ئەمەش هەموو ئەو تێروانینە شمولی و ڕەهاگەریانەیە کە توانااداری دیاردەکە هێندە بێبایەخ و کورت و بچووکدەکاتەوەو دەبینێت تا رادەی گومڕاکردنی و هەڵوەشاندنەوەو چزکردنی . تێڕوانینێك کە هەموو حەقیقەتەکانی جیهان لە یەك حەقیقەتدا بچوك و قەتیسدەکاتەوە. کە ئەویش تەنها لە تێروانینەکانی ئەو دایە. و بۆ خوێندنەوەی شتەکان، دیاردەکان لە رموز و ئاماژەکانەوە دەست پێنەکات، نەك جەوهەرو کاکڵەی ئەم رموز و ئاماژانە!!.

ئەم دوو جۆرە خوێندنەوەیە ، کە هەریەکەیان بە شێوازێك و لەمەوقعێکی پەیوەندی نێوان دیاردە و دەوروبەر، دیاردە و کۆمەلگە لە

دیاردەکە دەگات ، و دەیەوێت لێیبگات. ئەگەر لە یەکەمیاندا بێ پرسی دەوروبەر، کۆمەڵگە، دیاردەکە خۆ دەسەپێنێ !. ئەوا لە دووەمیاندا ئەوەی پرسی پێناکرێ و گوێی لێناگیرێ و بەهەمەندناگرێ دیاردەکە، قسەو گوزارشت و تایبەتمەندییتیەکانی دیاردەکەیە!. دیسانەوە ئەگەر لە یەکەمیاندا دینامیکیەتی تەواوەتی ئەدرێتە دیاردەکە. و وەها لە پۆزەتیڤبوونی ئەم دینامیکیەتە دەڕوانرێ کە توانای تەواوی راڤەکردنی حەقیقەتی خۆی هەیە. و بەرادەیەك وێنای ئەستوریی دیواری بازنەی تایبەتمەندێتیەکانی ئەو دیاردەیە دەکات ، کە لە ناو دیاردەکە خۆیدا نەبێت نەتوانرێت بخوێندرێتەوە !. ئەوا لە دووەمیاندا بە رادەیەك ئەم توانا و پۆزەتیڤبوونە لە دینامیکیەتی دیاردەکە نەتەکێنێ، کە لەهەر توانایەکی خودخوێندنەوە بێبەشیدەکا. و ئەم خوێندنەوەیە ئەسپێرێتە دەرەوەی دیاردەکە!، ئەسپێرێتە پۆزەتیڤکردنی روئیاشمولیەکانی میتۆدێك، کە هەزارەها پاساوی دئاشینی ئەم پۆزەتیڤبوونەی هەیە. هەر لە ئەفسانەی کولتووریەوە تا دەگات بە ئەفسانەی ئایدیۆلۆژیا عەلمانیەکان .

ئەڵێم ئەم دوو جۆرە خوێندنەوەیە لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیە جەوهەریانەی نێوانیان. ئەوەی کۆکیان دەکات ئەو میتۆدە شیکاریەیە کە ئەم جیاوازیانە و ئەم جۆرە خوێندنەوە وتێگەیشتنانەی پێدەنووسرێتەوە. میتۆدێك کە رەهاگەری و ئاکرۆنیایی و ستوونیە.

میتۆدێك کە هەمیشە لە ئیشکردنەکانیدا، وێناکردنێکی دوو جەمسەری هەیە: جەمسەرێکی پۆزەتیڤ و دینامیکی و پڕ، جەمسەرێکی نێگەتیڤ و پریمتیڤ و بۆش. ئاراستە هەمیشە لە جەمسەری یەکەمەوەیە بەرەو دووەم، بەبێ پەرچەئاراستەو پەرچەکردە و پەرچەڕوئیا !، بەواتایەك بەبێ راوەستان و تەنانەت رێپێدانی ئەم پەرچەئاراستەو پەرچەکردەو پەرچەڕوئیایانە .

میتۆدێك کە هەمیشە: ئەو روئیایە بە حەقیقەت دەزانێ کە روئیای خۆیەتی. و هەرچی روئیاکانیترە دەخاتە بازنەی هەڵەیی، و

گومڕابوونەوە ، و بۆ جزکردنیان تێدەکۆشێ ، ئەو وێنانە بە حەقیقەت دەزانێ و دەبینێ کە خۆی دەیانکێشێ و ڕەنگیاندەکات ، و هەرچی وێنەکانیتره دزێو و ناشرینەدەکات، و دەکوژێنێتەوە !، ئەو قسانە بە حەقیقەت دەزانێ و دەبیستێ کە خۆی دەیانکات. و هەرچی قسەکانیتره بە وڕێنە دەزانێ و هەوڵی کپکردن و خنکاندنیان ئەدات !، ئەو شتانە بە حەقیقەت دەزانێ کە خۆی وێنایاندەکات، وهەرچی شتەکانیتره، ئەگەر توانای ڕیشەکێشکردنیانیشی نەبێت ، یان چاوی خۆی لە ئاستیاندا نابینا دەکات، و ئەو هەستە سڕدەکات کە وێنایاندەکات !، یان دەکەوێتە کوێرکردنی چاوەکانی بینیان !. بەڵام دیاردە کۆمەڵگەییەکان تەنها بەوە کۆمەڵگەیی نابن، کە گوزارشتی کۆمەڵگەییدەکەن. بەڵکو بەوەش کە گوزارشتی کۆمەڵگەییان لێدەکرێت. لەمەوەیە کەیەکەی سەرەکی بۆ نیشکردن، بۆ خوێندنەوەی دیاردەکان دەبێت خودی کۆمەڵگە بێت. کۆمەڵگە لەو ساتە مێژووییەی تیایدایە، وئەو دیاردەیە بەرهەمدێنێ، یان بەرجەستەدەکات. دیاردەکان دێن و دەچن ، پەیدا دەبن و زەقدەبنەوە، و وندەبن و تیائەچن . ئەگەر هەندێك دیاردەش لە چەند قۆناغێکی کۆمەڵگەدا بەردەوامیبداتە خۆی و هەبێت، وەك ئەریتە کولتووریەکان. ئەوا بە شێوە سەرەتایی و یەکەمیەکەی نامێنێتەوە ، و لەگەڵ هەرگۆڕانێکی کۆمەڵگە، و خۆداڕشتنەوەیەکیتری کۆمەڵگە، ئەمیش گۆڕانی بەسەرداێت – با خودی ئەو دیاردەش ئەوە نەسەلمێنێ – و بە داڕشتنەوەی نوێ ئامادەی مێژووە جیاوازەکان دەبێت. لەمەشەوە هەم ئەو بابەتانەی گوزارشتیلێدەکات جیاوازدەبن . و هەم میکانیزمەکانی ئەم گوزارشتکردنەشی جیاوازدەبن. ئەمە بۆ هەموو دیاردەکان وەهایە چ کۆمەڵگەییبن یان جیهانیی. وەك چۆن دیاردە کۆمەڵگەییەکان ڕەیەڵبەندیان بە سستمی گشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەوە هەیە، و دەبێت لەوێوە بدۆزرێنەوە وشیبکرێنەوە. ئاوەهاش دیاردە جیهانیەکان دەبێت لەو سستمە گشتیە نێودەوڵەتی و نێوکۆمەڵگەییانەوە بخوێندرێنەوە کە لەو

ساتە جیهانیەدا هەیە. من کە لێرەدا ئاماژە بەمە ئەدەم لەوەوەیە کە کۆچ هەم دیاردەیەکی کۆمەڵگەییە و هەم دیاردەیەکی جیهانیی.

بەر لە کۆتاییهاتنی ئەم بەشەش دەبێت ئەوە بڵێم کە هەموو بەشەکانیتری ئەم نووسینە تەرخانی بە دەرخستنی ئەو حەقیقەتەیە کە چیتر ئەم جۆرە تەڕوانین و شیکارییە بۆ خوێندنەوە وراڤەکردن و تێگەیشتنی دیاردەکان دەستنادەن. وەهەڵەیەکی گەورە وبێئاکامیەکی رۆشنە گەر بۆ پرسی کۆچ پەنابیرێتەوە بەر ئەو میتۆدورونیا مەعریفیانەی کە تەنانەت یەکتریان پێناخوێندرێتەوە. ئەمیش لەوێوەیە کە نە دیاردە و حاڵەتە کۆمەڵگەییەکان لە خۆوە و بێپێشینەیەکی کۆمەڵگەیی و جیهانی دەردەکەون و نەپەرپەمیتیڤیشن. سەرەرای ئەمەش لە ئێستەدا ، ئێستەی زەمەنی جیاوازیەکاندا ، حەقیقەت نەك لای هیچ میتۆدو روئیایەك نیە. بەڵکو خودی حەقیقەت هەر رەهاگەریەکی تێڕوانین و هەر رەهاگەریەکی بناغەرێژبوونیی رەتدەکاتەوە . زەمەنی ئێستا زەمەنی ئاراستەتەریبەکانی شوناسەکان نیە ، هەرچەندە ستەمیشە زەمەنێکی وەها لە مێژووی کۆمەڵگەیانەی مرۆڤایەتیدا هەبێت ــ بێگومان ئەمە لەدەرەوەی ئەو راڤەکردنە لۆکاڵی و کولتوورگەریەی تەریبکردنی شوناسەکانە ـ زەمەنی ئێستا زەمەنی بەریەککەوتن و چوونەناویەکی شوناسەکان و یەکترناسینی شوناسەکانە . جا چ ئەمە بەوبیوەدابێت کە لەیەکتری بپڕنگێنەوە ، یان بەوبیوەدا کە بکەونە دیالۆگکردنی یەکتری و لێکگەیشتن و لێبوردەیی .

## بـەشی سێیەم

بۆ ساغکردنەوەی ئـەو پرسیارانە - پرسیارەکانی بەشی یەکـەم - بـۆ تێگەیشـتن لـە حەقیقـەتی کـۆچ، دەبێـت بگەڕێینـەوە زەمـەنی کـۆچ، شوێنکاتی مێژوویی کۆچ. زەمەنی کۆچیش هەم زەمەنێکی جیهانیـە و هـەم زەمەنێکی کۆمەڵگەیی.

(( کۆتاییەکانی ئەم سەدەیە شێوەیەکی
جیاواز لە ژیانی مرۆڤایەتیە))[٦]
(( کۆتاییەکانی جەنگی سارد خێرابوونی
گەورەی گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکانە))[٧]

جیهان ئێستا بە گشتی، لە دوادەیەی سەدەی رابـردووەوە - سـەدەی بیسـتەم - بـە وەرچـەرخان و گۆڕاویـەکی مـەزندا گـوزەر دەکـات. وەچەرخانێك کە تـەواوی ژیـانی مرۆڤایـەتی و شـێوازەکانی بـەڕێوەچوون و بەرێخسـتنی ئـەم ژیانـەو میکـانیزم و گوزارشـتەکانی ئـەم بـەڕێوەچوون وبەرێخستنەی لە بـەردەم داڕشتنەوەیەکی نـوێ و فۆرمێکی نوێدا دانـاوە. هـەر لـە سستمی نێودەوڵەتی و جیهانیـەوە، تـا دەگـات بـە سسـتمی گشـتی کۆمەڵایـەتی کۆمەڵگەکان. ئـەوەی ئێسـتا دەکرێتـە بناغـە بـۆ پۆلێنکردنـی دەوڵەتـەکان، کۆمەڵگـەکان. ئـەوەی لـەم پۆلێنکردنـەدا وەك رێسـایەك جێگربـووە و هـەوڵی جێگـیربوونی تەواوەتیانـەی ئـەدرێ، و کـارپێدەکرێ وقسەی لەسەردەکرێ. وکۆمەڵگە و دەوڵەتەکانی پـێ شوناسیی وتایبەتمەند و جیادەکرێتەوە، جیاوازە.

جیاواز لەوەی کە نزیکـەی نیـو سـەدە - سـەردەمی جـەنگی سارد - بـوو لـە سـەری راهـاتبووین وتێیدەگەیشـتین و بەنئاسـانی و سـادەیی

رفەماندەکرد. ئێستا جگە لە پیاوە ئایدیۆلۆژیاکان، سیاسیە ئایدیۆلۆژیاکان پیاوانیتریش هاتوونەتە کایەی سیاسەتکردن و کایەی دایالۆگ و گەمەو شەڕ و ململانێی کۆمەڵایەتی وکۆمەڵگەییەکان، کایەی پەیوەندی و دیالۆگکردن و زۆربۆهێنانە نێودەوڵەتی ونێوکۆمەڵگەیی وجیهانیەکان. ئەم پیاوانە ئێستا زۆریان لە دەسەڵاتی سیاسیە ئایدیۆلۆژیەکان بۆ خۆیان بچڕیووە. پیاوەکانی ئەمڕۆی کارگێڕیی کۆمەڵگەکان و جیهان، گوتاربێژ و پرۆژەسازە کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی و جیهانیەکانی ئەمڕۆی جیهان، تەنها ئەو پیاوە ئایدیۆلۆژیانە نین، کە بۆ نزیکەی نیوسەدە پەیامی ئایدیۆلۆژیان بەگوێی جیهان و مرۆڤایەتیدا ئەدا. و جیهان و مێژوویان رەنگ و رەوت ئایدیۆلۆژیکردبوو بەڵکو ئەو ((براهما )) و ((سانفا )) و ((کەهەنووت )) و ((زانا ئاینی)) یانەشن کە پەیامی ویژدانی و مۆراڵی و رۆحیان پێیە . و لەپشتی ئەم پەیامەوە بەرژەوەندیە تایبەتیەکان و نەتنییەکان دەشارنەوە. ئەو تەکنۆکرات و پارەدار و سەرمایەدارو ئیکۆنۆمیست و پیاوانەشن کە کارگێڕی دامەزراوە نێودەوڵەتی و جیهانیە بازرگانی و ئابووری و داراییەکانن . و پەیامی ((گلۆبالیزەیشن)) و تەکنۆلۆژیا و ((کۆمەڵگەی زانین)) یان پێیە، دامەزراوەکانی ئەمڕۆی سیاسەت تەنها حزبە ئایدیۆلۆژیاکان نین، کە بۆ بەئایدیۆلۆژیکردنی کۆمەڵگە وجیهان تێدەکۆشان. بەڵکو ئەو حزبە ئاینیانەشن کە بۆ بەئاینیکردنەوەی کۆمەڵگە، و بەکۆمەڵگەییکردنەوەی ئاین، بۆ بە ئایدیۆلۆژیکردنەوەی ئاین، تێدەکۆشن. ئەو حزبانەشن کە لەسەر تایبەتمەندێتیە کولتووری و نەتنییە پێشمۆدێرنێتیەکان خۆڕاگیردەکەن . ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانەشن کە لەسەر ئاکامە نێگەتیفیەکانی تەکنۆلۆژیا ڕادەوەستن و (( ئەنتی -تەکنۆلۆژیا )) و ((ئەنتی - گلۆبالیزەیشن ))ن. ئەو دامەزراوە دارایی و بازرگانی و ئابووریانەشن کە پێکهاتە و نارستەیەکی (( سەرو قەومی)) و ((نێو دەوڵەتی )) و جیهانیان هەیە ، میتۆدەکانی ئەمڕۆی (( ئیشکردنی مێژوویی ))[٨]. تەنها میتۆدە

ئایدیۆلۆژیاکـــان نیـــە . بـــەڵکو میتۆدەکـــانی پێشـــمۆدیرنیتە ، و پۆستمۆدێرنیتەشـــە، ئـــەمرۆ جگـــە لـــە ئایدیۆلۆژیـــا ، ئاینـــەکانیش و تەکنۆلۆژیاش لە مێژوونوسینەوەی کۆمەڵگـەکان و جیهان بەشـدارن. ئێستا جگـە لـە دەوڵـەت ، دامـەزراوەیتریش : کۆمپانیـا ڕەگەزبەرەکان و دامـــەزراوە داراییە نێودەوڵەتیەکان و دامەزراوە بازرگانیە جیهانیـەکان ((WTO)) لـە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەو بەڕێوەبردنی جیـهان ، لـە ژیـانی کۆمەلآیـەتی و کۆمەڵگـەیی و جیـهانیدا ، نـەك هـەر بەشـــدارن ، بـەڵکو زۆربەشـیان لـە دەسـەلآتی دەوڵـەت بـۆ خۆیـان پچڕیـووە . بەشـێکی بـەرچاوی وەزیفـە دامەزراوەکانی دەوڵـەت بـە نێودەوڵەتیبووە . هـەرچی ئـەو دامـەزراوە نێـو دەوڵەتیانەشـە کە پێشتر هـەبوون وەك (UN ) ئێستا بـە وەزیفـەی نوێـوە ئامادەی مێژوون، زۆریان لەو سنوور و سـەروەریانە بڕیـووە کە پێشتر هـەر ئەم دامەزراوەیە تەقلیسیدەکردن. جیهانی ئێستا جیهانێکە: شوناسـەکان، ئینتماکان، وێناکردنـەکان، تێڕوانینـــەکان، تایبەتمەندێتیـەکان لـە فـەزای ((دوانـەیی ))، لـە بازنـەی ((دوانـەیی)) ئایدیۆلۆژیـا ئـەترازێنێ . بـەرەو فەزایەکی ((شمولیبوونی جیهانیـە ))[٩] و فرەییبوونـی لۆکاڵیانـە، سنووره ئەستورەکانی ئایدیۆلۆژیا ئەترازێنێ بەرەو ((بێسنوور))یـەکی جیهانی ، و سنووری بچوکبچوکی لۆکالیی، جیهانێکە بۆ تەنککردنـەوە و کاڵکردنـەوەی سـنوورەکانی دەوڵـەت، و دەسـەلآتی دەوڵـــەت ((لەبـــەرەژەوەندی کۆمەڵـە بانقـەومی بنقەومیـەکان لـە ڕێـی هەسـتکردن بـە هاریکـاری ئـەتنیی و ئاینی))[١٠]، جیهانێکە لەو کاتەی پابەندی بۆ دەوڵەتێك بەرەو پابەندییەکی جیـهانیی تێـدەپـەڕێنێ ، پابـەندی لۆکـاڵیی بچوکبچـوك بەرهـــەمدێنێ و زەقدەکاتەوە، بە کورتی جیهانێکە بـۆ ((کرانـەوەی کۆمەڵگـەکان بـە ڕووی جیاوازیـەکانیدا. ))[١١] جیهانی ئێستا، جیـهانی هـەم تـەکاندنی موتڵـەق و حەتمیــەت ، و هـــەم وێنـــاکردن و بەرجەســـتەکردنەوەی و موتڵـــەق و حەتمیەتە . ئەمـــەش بـەو مانایـەی لەوکاتـەی موتڵـەق و حەتمیـەت لـە ئایدیۆلۆژیـــا دەســـێنێتەوە ، وێنـــاکردن بـــۆ حەتمیـــەت و موتڵـــەقیتر

قووتەکەتەوە : ڕوانین لە گلۆبالیزەیشن وەك حەتمیەتێك کە گەڕانەوەی بۆنیەا. وەك ((ئایندەیەك کە لەودیوی ئەوەوە ئایندەی ترنیە !))[12]. و (توانای وەستانەوە بە ڕووی گلۆبالیزەیشن هەمان توانای وەستانەوەیە بەڕووی زریان "اعصار")[13]دا!، جگە لە پێداگیری و جێکردنەوە بۆ موتڵەق و حەتمیەتێکیتر شتێکیتر نیە ، ئەمە هاوشانی هاتنەوەکایەی موتڵەق و حەتمیەتە پێشمۆدێرنیتیەکان لە کۆمەڵگە لۆکاڵیزمیەکانیشدا . بە کورتی جیهانی ئێستا ، جیهانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و کتێبە ئایدیۆلۆژیاکان و کتێبە پیرۆزە ئاسمانیەکان . جیهانی ململانێ تەکنۆلۆژییەکان، ململانێی نێوان کۆمپانیارەگەزبڕەکان ، نێوان فراکسێونە ئیقلیمیە ئابوری و بازرگانیەکان . جیهانی ململانێی ئایدیۆلۆژیاکان و جیهانی ململانێی شمشێرەکان ، و جیهانی ململانێی تەکنۆلۆژیاو ئایدیۆلۆژیاو شمشێرەکانیشە لەگەڵ یەکتری و لەبەرامبەر یەکتری . پشتەوەی ئەم وەرچەرخان و گۆڕاویەش دوو پرۆسسی پێکەوەهاتوون کە دەکرێت گەر بەکورتیشبووە ئاماژەیەکیان بۆ بکرێت، کە ئەوانیش ((شکستی ئایدیۆلۆژیا )) و ((گلۆبالیزەیشن))ن .

**یەکەم : شکستی ئایدیۆلۆژیا**

لە تافی هەژموونگەری جیهانیانەی ئایدیۆلۆژیادا؛ جیهان بە هەموو ڕاگیریە نێودەوڵەتیە سیاسی و ئابووری و بازرگانیەکانیەوە، بە هەموو ململانێ گەورە – جیهانی – و بچوك – نێوان دەوڵەت و ناو دەوڵەت – ەکانیەوە، لە هەموو جەنگە سارد و گەرمەکانیدا ، لە هەموو بلۆکبەندییە ئاسایشیی و میلیتاریزمیی و ئابووری و بازرگانیەکانیدا، لە هەموو ڕیزبەندیە کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی و دەوڵەتیەکانیدا، لە هەموو پەیماندان و واتاداریەکانیدا ، لە هەموو شوناسسازیە کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی ، ڕۆشنبیری و کولتووری، مێژوویی و جیهانیەکانیدا. ئایدیۆلۆژیا ئامادەیەکی هەژموونگەریانەی هەبوو. ئایدیۆلۆژیا لەم تافەدا

ڕەنگڕێـژی سـێ پـڕۆژەی کۆمەڵگـەیی گـەورە بـوو، کـە لـە سـێ دەسـتە کۆمەڵگەی جیاوازدا بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگە و دەوڵەت ، ڕێکخستنەوەی ئابووری و سیاسەت، و بۆ ڕۆشنبیری کۆمەڵگە، تەزموونکرا.

((ئیشکردنی مێژوویی ))یانەی ئایدیۆلۆژیا لەم سێ پڕۆژەیەدا ، لەم سێکۆچکە و سێبەشەی جیهاندا، جیاواز بـوو. ئەمـەش بـە هـۆی ئـەوەی کـە هـەر دەسـتە کۆمەڵگەیـە بـە مێژوویـەکی تایبـەت و ئاسـتێکی گەشەسەندنی تایبەت و جیاوازەوە لە دوو دەستە کۆمەڵگەکەیتر ئامادەی ئەم تاقەبوون. لە مەشەوە سێ مۆدیلی جیاواز لە مێژوونووسینەوە سەری هەڵدا، سێ مۆدیل لە سستمی سیاسی، لە ئابووری کۆمەڵگەیی، لە رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کە دەکرێت بەم شێوەیەو بە کورتی باسیان بکەین:

- لە بلۆکی خۆرئاوا "لە جیهانی ئازاد" پڕۆژەی (( دەوڵەتی خۆشگوزەران)). مۆدیلی ئیشکردنی مێژوویی ئایدیۆلۆژیا لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا بەم شێوەیە بوو:

دەوڵـەتی دیموکراسـی " کیـنزیزم " + مەعریفـە کولتـووری مۆدێرنیتە + ئـابووری بـازاڕ بۆ ئـەزموونکردنی مۆدێرنـە و مۆدێرنیتە و هەڵگشانی ئەم دوانە.

- لە بلۆکـی خۆرهـەڵات "لـە جیـهانی کۆمۆنـیزم" پـڕۆژەی ((کۆمۆنیزمیی)).

مودێلی ئیشکردنی مێژوویی ئایدیۆلۆژیا لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا بەم شێوەیە بوو:

دەوڵەتی سوسـیالیزمی " تۆتالیتـاریزمی چـەپ " + مەعریفـە و کولتووری مۆدێرنیتەی سۆسیالیزمی + (( ئابووری بازاڕی)) بەپلان بۆ ئـەزموونکردنی مۆدێرنـەی پیشەسـازیبوون و گواسـتنەوەی کۆمەڵگـە بـۆ دوای میتافیزیکیـەت و کشـتوکاڵی. بـەهۆی مۆدێرنیتەیەکەوە کـە دەکرێـت بـە مۆدێرنیتـەی ئـایدیۆلۆژی ناوبێرببکەین .

• لـــه جيـــهانى ســـێ، پـــرۆژەى (( تەنميـــەى ئـــابوورى و سەربەخۆيى سياسى)).

موديلى ئيشكردنى مێژوويى ئايديۆلۆژيا لەم دەستە كۆمەڵگەيـەدا بەم شێوەيە بوو:

دەوڵـەتى كۆپێكـراوى دوو مۆديلـى خۆرهـەلات و خۆرئـاوا لەســەر دەستى ئايديولوژيا –بەڵام زۆرتـر ئايديۆلۆژيـاى چـەپ - دەوڵـەتى ئـايديۆلۆژى ديكتـاتۆرى و ميليتـاريزمى + مەعريفـە و كولتـــوورى پێشمۆدێرنيته + ئابوورى زۆرتر كـەرتى گشتى و دەوڵەتى و كـەمتر كـەرتى تايبـەت بـۆ‌چەقبەســتوويكردنى كۆمەڵگـە لـە حاڵـەتێكى گواستنەوە بۆ دواى كشتوكاڵى !.

بـه كورتـى، ئيشكردنى ئايديۆلۆژيـا لـەم سێ دەســتە كۆمەڵگەيـەدا جيـــاوازو هاوشـــانى مەعريفـــە و كولتـــوورى جيـــاواز بـــوو، وەك ئاوێنـــە كردنەوەيـەكى حەقيقـەتى جيايى ئـەم ســێ دەســتە كۆمەڵگەيــە لــە رووى ئاستى گەشەى مێژوويى، وهمومى كۆمەڵگەييەوە.

- له خۆرئاوا، ئايديۆلۆژيا + كولتوورى مۆدێرنيتە.

- له خۆرهەلات، ئايديۆلۆژيا + كولتوورى ئايديۆلۆژى و مۆدێرنيتـەى ئايديۆلۆژى

- لـــە جيـــهانى ســـێ، ئايديۆلۆژيـــا + كولتـــوورى پێشـــمۆدێرنيته و ئەنديشەى مۆدێرنيتەبوونى ئايديۆلۆژى.

لەمەوە لەم كورتە باسەوە دەتوانين ببێنـه باسكردنى دواى شكستى ئايديولوژيـا وتـــافى دواى ئايديۆلۆژيـــا. كـــە بەهـــەمان ســـێ مۆديلبوونـــى ئيشكرنەكانى تافى هەژموونگەريانـەى ئايديۆلۆژيا ، لە بەشكستچوونيشدا سێ مۆديليبوو. سێ مۆديل، لە قەيرانى پاى شكست، لە پـەراوێزبوون و پەرچـەكردەى پـــەراوێزبوون، لـــە ئەنديشـــەى خۆشووناســـيكردنەوە، لـــە نائەقلانيەت و نسوولگەرى و پۆتۆپيا، له ململانێى سەرەكى ناو كۆمەڵگـە و

جەمسەرەکانی ململانێ، و دواجاریش لە ئەندێشەی خۆدارشتنەوەی تێپەڕینی قەیران.

لە تافی دوای ئایدیۆلۆژیاشدا کۆمەڵگەکان بەهەمان جیایی ئاستی گەشەی مێژوویی و هومی کۆمەڵگەیی ئامادەبوونیان لە سەردەمی ئایدیۆلۆژیادا، ئامادەی ئەم تافە دەبنەوە. ئەمەش لەوێوەیە کە ئەو سێ مۆدێلبوونەی ئیشکردنی ئایدیۆلۆژیا سێ مۆدێلبوونێکی نووسینەوەی مێژوو، و سێ مۆدێلبوونێکی هەڵکشانی کۆمەڵگەبوو. لەمەشەوە کۆمەڵگەکان بە سێ دەستەیبوونێکیترەوە دەکەونەوە مێژوونووسینەوەی خۆیان و هەڵبژاردن و ئەزموونکردنی میتۆدی جیاواز بۆ ئەم مێژوو نووسینەوەیە. کە پێچاکە بەهەمان هەڵوێستەی کورت و راگوزەریانەی پێشوو، لەسەر ئەم سێ مۆدێلبوون و سێ دەستەیبوونە نوێیەش هەڵوێستەبکەین:

- لە خۆرئاوا، لە کۆمەڵگە گلۆبالیزمییەکاندا: ئایدیۆلۆژیا لە سستمی سیاسی، لە دەسەڵاتی سیاسیدا ماوە. وەلێ لەو رەنگە تۆخەی جارانیدا، وشکستی لەوەش خواردووە کە ناتوانێت دەسەڵاتە پێشوونەکانی بپارێزێ و تادێت رۆڵی کارگێریی کۆمەڵگەیی و جیهانیانەی بەرتەسکدەبێتەوە، وتادێت جووڵە و گەمە کۆمەڵایەتییەکانی لە ئیرادەی خۆی ئەترازێ و دەکەوێتە سایەی تەکنولوژیاو داواکارییەکانی تەکنولوژیاوە، قەیرانی ئەم دەستە کۆمەڵگەیە قەیرانێکی سنووردار و قەیرانی پای گواستنەوەیەکی بەرزهەڵکشانی کۆمەڵگەیە. گواستنەوە لە تاف و کۆمەڵگەی (( پیشەسازی))یەوە بەرەو تافی کۆمەڵگەی ((زانین)). بنەچە وجڵەوی ئەم گواستنەوەو بەرزهەڵکشانەشی لای تەکنولۆژیا و زانستە، پەراوێزبوون ((کۆمەڵایەتی))یانە و پرسی بەشێکی کۆمەڵگەیە، ولە بەرامبەر دەسەڵاتی لە برەوی تەکنولۆژیا وەك (( سستمێکی زۆر بۆ هێنانی تەکنۆکراتی))[14] یانە، برەو ئەدرێتە مەیل و ئەندێشەی نوتۆریتاریزمی سیاسیانە وەك گوزارشتکردن لە ((قۆناغێکی پێشفاشیزمی))[15]. و

ئامادەکاری راسیزمیانەی ئەزموونکردنەوەی فاشیزمی، لێرە لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا، ململانێی سەرەکی لە نێوان پیاوانی دوێنێ و پیاوانی ئەمڕۆدایە. پیاوانی ئەمڕۆ تا دێت دەسەڵاتی کۆمەڵگەیی و جیهانیانەیان بەرینتر و تۆکمەتر دەبێت، وپیاوانی دوێنێش لە (( بەرەنگاری))یەکی بێئاکام لە گەڕاندنەوەی دەسەڵاترۆیشتنە دوێنێیەکانیان دەکەن: ((زوربەی سیاسیەکان تا ئێستاش ئەوە نازانن کە لەمڕۆدا نەك هەر لەژێر سانسۆری بازارەکانی دارایدان بەڵکو بوونەتە سایەی دەسەڵات و هەژموونگەریی ئەم بازارەش))[16]. (( ئیتر سیاسیەکان خاوەنی زۆر بواری دەسەڵاتیی کارای وەهانین کە بتوانن بڕیاربدەن، کەچی وا وێنادەکەن کە توانای چارەسەری گرفتەکانیان هەیە. من ئەڵێم ئەمانە تووشی وەهمبوون.. خەو بەوەوە دەبینن کە توانایەکی وایان هەیە))[17].

- لە دەوڵەتەکانی بلۆکی سۆسیالیزمی جاران، لەم دەستە کۆمەڵگە لۆکالیزمییەدا:

ئایدیۆلۆژیایەك لە سستمی سیاسی، و لە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگە ودەوڵەت، لە بەرزهەڵکشانی کۆمەڵگە شکستێنێ. و بۆ تێپەڕینی ئەم شکستە کۆمەڵگە دەکەوێتەوە خواستن لە خۆرئاوا. بەڵام ئەمجارەیان ئایدیۆلۆژیا ناخوازێت، بەڵکو سستمی ئابووری بازار و تەکنۆلۆژیا ((زانین)). و بۆ کاراکردن و فەراهەمکردنی ئەم خواستنەش تێزێکیتری ئایدیۆلۆژیا لە ئەزموونی سیاسەت و دەسەڵاتەدرێتەوە. لێرە قەیران، قەیرانی نەتوانینی هەڵکشانی کۆمەڵگەیە بۆ دوای ((پێشەسازیبوون))، پەراوێزبوونی پای ئەم قەیرانەش کۆمەڵگەیەکە بە گشتیەوە، کە ناتوانێت بە ئایدیۆلۆژیا و لەرێی ئایدیۆلۆژیاوە سستمە گشتیە کۆمەڵایەتیەکەی هاوچەرخانە دابڕێژێتەوە، لەمەشەوە، لەم نەتوانینەشەوە بەرەو ئەداتە ئەندێشەکانی ((بەرەنگار))ی لە بەرامبەر فەرمانەکان و هێرشەکانی گلۆبالیزمیشن، لێرە لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا ململانێی سەرەکی ناو کۆمەڵگە لە نێوان پیاوانی دوێنێ وپیاوانی ئەمڕۆدایە بەڵام دەسەڵات لای

پیاوانی دوێنێیە. وپیاوانی ئەمرۆش لە هەوڵی هێرشی بەردەوامدان بۆ کورتپێهێنانی ئەم دەسەلاتە.

- لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێی جاران، لەم دەستە کۆمەڵگە لۆکالیزمییانەشدا، ئایدیۆلۆژیا لە سستمی سیاسی و لە دەسەلاتدا ماوە بەلام ئەو شەرعیەتە کۆمەلایەتی و کۆمەلگەییانەی دۆڕاندنەوە، کە پێشترو لەپشتی ئەفسانەکانی نیشتمان و نیشتمانپەروەری و نەتەوەو ناسیۆنالیزمی، و لەپشتی چەپڕەوێتی سۆسیالیزمەبوون و پالدانەوە بەئەفسوونی جیهانیانەی کۆمۆنیزم بۆی فەراهەمدەبوو. لێرە دەوڵەت بۆیەکەمجارو بێپەردە لەمێژووی دروستبوونیەوە ، یان بۆ یەکەمجارو بەئاشکرابوونی دەمامکەکانی بەبێ ئایدیۆلۆژیا گوزارشت لە خۆیدەکات.[18] گوزارشتکردنێك کە تەنها ((درێژبوونەوەی سێبەری خۆیەتی))[19]. یاخود دەوڵەتێکە لە تێڕوانینەکانی (میکافیللی)یەوە خۆی دادەڕێژێتەوە، بەوەی تاکە (ماف) و (ئامانج)ێك کە هەیەتی (رزگار کردن)ی خۆیەتی. و جگە لەخۆی و بەپێوەڕاوەستانی خۆی نەك هەر هیچ ئامانجێکیتری نیە بگرە دژی هەر ئامانجێکیترە. دەوڵەتێکە کە (( بەهای تایبەتی خۆی هەیە بەهایەك کە لەرووی چەمك و بەکارهێنانیەوە جیاوازە لە بەها تایبەتیەکانی مرۆڤ))[20] یاخود بەلۆژیکێك دەجوڵێ و خۆی بەرپێوەدەبات و فەرمانڕەوایەتیدەکات کە ترازانی نێوان خۆی و کۆمەلگە ، و جیاواز لەهەر لۆژیکێکیترە کە بەرژەوەندییەکانی خەلك و بەرژەوەندییەکانی نیشتمان و نەتەوە خوازیارێتی . لێرە قەیران، قەیرانی کۆمەلگەیەکە، گشتیی کۆمەلگەیەك بەهەموو دینامیکیەتەکانیەوە ، قەیرانی بەداکشانبردن و پەراوێزبوونی کۆمەلگەیەکە کە دەیەوێت بە میتۆدەکانی دوێنێ و دوێنێی دوور ئیش لەمێژووی خۆیدا بکات. و وەهەمی ئەوەش جێگیربکات کە داڕشتنەوەی پای ئەم ئیشکردنەی سەردەمیانەیە!. ئەمیش لەو ئەندێشەیەوە کە فۆرمی تێگەیشتنی باوو بەدەسەلات لە ((سەردەمیبوون)) لێرە ((بەرگری)) و ((بەرەنگاری)) لە رەسەنایەتی

کولتوورییه. بەوتایەك لێرە قەیران قەیرانێکی ((فۆڵی مێژوویی)) [٢١] بە هەموو رۆچوونە مەعریفی و کۆمەڵگەییەکانیەوە، لێرە لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا ململانێی سەرەکی ناو کۆمەڵگە لە نێوانی پیاوانی دوێنێ و پیاوانی دوێنێی دووردایە. پیاوانی دوێنێ لە دەسەڵاتدان ، وەلێ بەبێ شەرعیەتی نیشتمانی ونەتەوەیی . و بۆمانەوەشیان لە دەسەڵاتدا درێژە بەزەبروزەنگی سیاسیانەو تێزەکانی دیکتاتۆری‌و تۆتالیتاریزمی راستڕەوی ئەدەن. پیاوانی دوێنێی دووریش لەرێی ئامادەکردنەوەو تەوزیفکردنەوەی (رەموز)ە میسۆلۆژیەکانی کولتوورەوە، کە ئانێستاش بە ئەکتیڤی لە یادەوەری و ئەندێشە کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە، هەوڵی سوپاگەریەکی کۆمەڵایەتیانە ئەدات بۆ جێنشینبوون لە دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی کۆمەڵگەدا، و دەرپەڕاندنی پیاوانی دوێنێ . بەواتایەکیتر، لێرە پیاوانی دوێنێ لە رووی سیاسیەوە، وپیاوانی دوێنێی دووریش لە رووی ویژدانی مۆراڵی وروحیەوە لە دەسەڵاتدان. لێرە ئەوەی پەراوێزێکی دەسەڵاتیشی بۆ ئەماوەتەوە پیاوانی ئەمڕۆن، کەهان تاك تاك و زۆر بەکەمی هەن . یان هەر پیاوەکانی دوێنێ و دوێنێی دوور بە رۆڵی ئەوانە هەڵدەسن وبەرگی ئەوان دەپۆشن. ئیشکالیاتی ئەم بەرگپۆشینەش بە کورتی لەوە دایە کە بە هێزێکی میسۆلۆژی کولتووریی و پێشمۆدێرنیتەیی و هێزێکی ئەندێشەکردووی مۆدێرنیتەی ئایدیۆلۆژی ، بەبێ بنەماو بنچەیەکی رۆشنگەری ، و بە ئەندێشە وهەمیەکانی سووتاندنی مۆدێرنیتە و رۆشنگەری و سووتاندنی مۆدێرنەی پێشەسازیبوون، مامەڵە لەگەڵ تەکنۆلۆژیا دەکرێت !!. و پەرە بە ئەندێشەی خۆماڵیکردنی کولتوریفەی تەکنۆلۆژیا ئەدرێت !. بە کورتی لەم سێ بەشەی جیهان، لەم سێ دەستە کۆمەڵگەیەدا، سێ مێژووی جیاواز لە ئێستەدا دەنووسرێتەوە.

- لەخۆرئاوا، لە کۆمەڵگە گلۆبالیزمیەکاندا، تەکنۆلۆژیا مێژوو دەنووسێتەوە. مێژوونووسینەوە هەڵکشانی کۆمەڵگەیە بەرەو دوای یان ئەودیووی مۆدێرنیتە و مۆدێرنەی پێشەسازیبوون . پەرچەکردەی ئەم

هەڵکشانەش بەنسوولێکردنی ئایدیۆلۆژیایە لە دوو تێزی نیونازیزم و نیوکۆمۆنیزمدا . تا ئەقلانیەتی پای قەیرانی ئەم هەڵکشانە ئانەقلانیەتی فەلسەفی ویوتۆپیای ئایدیۆلۆژیا شمولیەکانە. لێرە ململانێ لە نێوانی ئایدیۆلۆژیا و تەکنۆلۆژیادایە و دەسەڵاتی کارا لای تەکنولۆژیا یە . لەم کۆمەڵگەیانە دا خوێشوناسیکردنەوە گلۆبالیزمیو پۆستمۆدێرنیتەیی و ((زانین))و((تەکنۆلۆژیا))یانەیە.

- لە خۆر هەڵات لە کۆمەڵگە لۆکاڵیزمیەکانی پلەیەك. ئایدیولوژیا مێژوودەنووسێتەوە، مێژوونووسینەوە چەقگرتوویکرنی کۆمەڵگەیە لە مۆدێرنیتەی ئایدیولوژیانە و لە مۆدێرنەی پیشەسازیبووندا.[22] پەرچەکردەی ئەم چەقگرتوویبوون و نەتوانینی هەڵکشانەش نسوولگەری ئەتنیی – ناسیونالیزمیە. تا ئەقلانیەتی پای ئەم چەقگرتوویبوون و داکشانەش ئانەقلانیەتی ئایدیۆلۆژیانەیە بە ئەندێشەکانی ((بە ئایدیۆلۆژیکردنی تەکنۆلۆژیا ))! و ((بە کولتووریکردنی ئایدیولوژیا)). یوتاپیالێرە یوتوپیای ناسیونالیزمەبوونەوەو لە مەشەوە دەورانکردنەوەی دەسەلاتی دوێنێی سوفێتیە! . لێرە ململانێ لە نێوان ئایدیولوژیا و تەکنۆلۆژیادایە . ودەسەڵاتی کارا هێشتا لای ئایدیولۆژیایە . لەم کۆمەڵگەیانەدا خوێشوناسیکردنەوە هێشتا ئایدیولوژیانەیە ، ناسیونالیزمیانەیە ، و ئەمە وەك دارشتنەوەیەکی تێپەرکردنی لۆکاڵیزمیبوون سەیردەکرێ ، باسدەکرێ .

لە جیهانی سێ ، کۆمەڵگە لۆکاڵیزییەکانی پلە دوو، کولتوور و ئایدیولۆژیا پێکەوە مێژوودەنووسنەوە.[23] بەهەردوو فۆرمی لێکدانی ئایدیۆلۆژیاو کولتوورو سیستماتیزەکردنی ئەندێشەی بەیەککردن و پێکلێناوێتەکردنی ئەم دوانە. ئەویش لەتێزو ئەندێشەکانی بەکولتووریکردن یان بە عەقیدەیی و نارتۆدۆکسکردنی ئایدیۆلۆژیاو بە ئایدیۆلۆژیکردنی کولتوورو بەئایدیۆلۆژیکردنی میسۆلۆژیا. مێژوو نووسینەوە لێرە داکشانی کۆمەڵگەیە بەئەندێشەکردنی تێپەڕین لە وەهمو

بێتوانایيەكانی مۆدێرنيتەی ئايديۆلۆژی بەرەوگەڕانەوە سەر كولتـوور، و سـەر ((ڕەسـەنيبوونەوەی )) كولتووريانـە . و ئەندێشـەكردنی ((سەردەميبوون )) بە چەقگرتوويكردنی كۆمەڵگە لە حاڵەتی گواستنەوە بەرەو پيشەسازيبوون ، ئەمە لەگەڵ خواستنی تەكنۆلۆژيا وەك ئاشتنی گوڵێك لەسەر بەردێكی بەگڵنەبووی رەقەن . بەرچەكردەی ئەم داكشان و چەقگرتوويبونەش ئسوولگەی كولتووری و ئسوولگەری ئايديۆلۆژيانەيە . ئانەقلانييەتی پـای ئـەم چـەقگرتوويبوون و داكشانەش ئانەقلانييەتی ميتافيزيكی و كولتوورييە بـە ئەندێشـەكانی (( بـە ئـايديۆلۆژيكردنی كولتـوور)) و((بەميسـۆلۆژيكردنی كولتـوور)) و ((بـە كولتووريكردنـی سەردەميبوون )).

يۆتۆپيا لێرە يۆتۆپيای گەڕانەوەو داكشانی كۆمەڵگەيە بەرەوپێش مۆدێرنيتـە، و يۆتوپيـای شموولیـەتی كولتـوور، و يۆتۆپيـای ئوممـەی كولتووری و ئامادەكردنەوەی كۆمەڵگەو شارستانييەت و زەمەنی كولتـوورە . ئەمـە لـەپاڵ يۆتۆپيـای ئەندێشـەكردنەكانی ((بـەكولتووريكردنی ئايديۆلۆژيـا )). ململانـێ لـێرە لـە نێوانـی ئايديۆلۆژيـا و كولتووردايـە . ئايدۆلۆژيايـەكی خۆمـاڵيكردووی كولتووريانـەی شـەرمن و بێپرسـيار و بێـپرۆژەی عـەلمانی. و كولتووريكـی ڕەقـەنی بەميسـۆلۆژيكراو . لـەم كۆمەڵگەيانەدا خۆشوناسيكردنەوە زۆرتر كولتووريـی و پێشمۆدێرنيتەيی و كەمتر ئايديۆلۆژی و پێشگلۆباليزەيشنە.

دووەم / گلۆباليزەيشن

هاوكـاتی شكسـتی ئايديۆلۆژيـاو لەميشـەوە جێكـەوتنی دۆخێكـی قەيرانگرتووی جيهانيی ، ڕەوتگرتنـی (( گلۆباليزەيشن ))ە: كە بـە هـەموو دەسەڵات و هەژموونگەريە ئابووری و دارايی و بازرگانيەكەيەوە، بە هـەموو ڕاگيريـە زانسـتی و تەكنۆلۆژيەكانيـەوە ، بـە هـەموو پەيامبەخشـين و واتـاداری و شوناسـريزييە جيهانيەكەيـەوە ، بـە هـەموو كوتانـە

جیهانیەکەیەوە بۆ تەنککردنەوەو بڕین و کەمترخاننی دەسەلات و سنووری مەدەنی و کولتووری و ئەتنییەکان. و لە دەرەوەی پێداگیریی و خۆڕاگرکردنە ئایدیۆلۆژیەکان ، و لە دەرەوەی ئیرادە و خوازیاری و ئەندیشەکانی سیاسەتمەدارو حزب و دەسەلاتە سیاسەکان، و لەدەرەوەی پێشداوەریە فەلسەفی و کولتووری ئایدیولوژیەکان بەرجەستەی جیهان بووە. و هەموو کۆمەلگە و نەتەوەکان، کۆمەڵە ئەتنیی و کولتووری و رۆشنبیریەکانی لە بەردەم پرسیاری زۆر جەوهەریدا داناوە. گلوبالیزمیش هاوکاتی شکستێک، شکستی ئایدیۆلۆژیا، خۆی تەرحدەکات و ڕەوتدەگرێت. هەر بۆیەش خۆی وەك ئەلتەرناتیڤ و دوای ئایدیولوژیا، و وەك پرۆژەیەکی شمولیی جێگرەوەی هەر سێ پرۆژە کۆمەلگەییە ئایدیولوژیەکەی پێشخۆی و وەك شوناسی دوای ئایدیولوژیا و دواشوناسی شمولیی مرۆڤایەتی خۆی تەرح و پێناسەدەکات.

لە تافی ئایدیۆلۆژیادا، ئایدیۆلۆژیا لە هەموو شتەکاندا بوو. هەموو شتەکان ئایدیۆلۆژیبوون. هەموویان وتاداری خۆیان لە ئایدیۆلۆژیاوە دەهێنا. هەر بۆیە کاتێك ئایدیۆلۆژیا شکستدێنێ ، دارمان و وونبوون و قەیرانێك دەکاتە بەشی کۆمەلگە: دارمانی هەموو ئەو رموز و پێوانەو ڕێسابەهایانەی کەکاری دەستەجەمعی و(( روئیای دەستەجەمعی بەرەو ئاییندە))[٢١] فەراهەمدەکەن، وونبونی ئاراستەکان و هاوسەنگیەکانی ناسینەوەی شتەکان و ناونانی ناسانی شتەکان ، وقەیرانی دۆڕانننی شوناس ودۆزینەوەی شوناس. قەیرانی پەراوێزبوون و قەیرانی دەربازبوون لە پەراوێزبوون. وقەیرانی دۆزینەوەی ڕێگەکان و فۆرمەکانی خۆشوناسیکردنەوەی نوێ وخۆسەلماندنەوەو خۆدارشتنەوەی نوێ.

جیهان دوای ئەم شکستە بەیەك فۆرم و یەك مۆدیل هەوڵی تێپەڕینی شکست و دارمان و وونبوون وقەیران نادات. بەیەك فۆرم و یەك مۆدیل خۆی شوناسیناکاتەوە، وەك ئەوەی گلوبالیزمیش دەیخوازێ و فەرمانی پێئەدات و وێناو ئەندێشەیدەکات. ڕاستە شوناسەکان پێشتر لە

سەرتاسەری جیهاندا ئایدیۆلۆژیبوون ، بەلام تیزی ئایدیۆلۆژی جیاوازو میتۆدی (( ئیشکردنی میژوویی ))یانەی جیاواز. هەر بۆیەش فۆرمەکانی شکست و دارمان و وونبوون و قەیران ، جیاواز دەبن. و کاتیکیش گلۆبالیزمیشن پەیامی شوناسیکی جیهانیی ((شارستانیەتیکی جیهانیی ، کۆمەلگەی جیهانیی ))ئەدات . و لە حەتمیەت وموتلەقەکانی پیشووتری ویناکردنەکانی شوناسی ئایدیۆلۆژیاوە حەتمیەت و موتلەق دەداتە شوناسە جیهانیەکەی، بەرەنگاری رووبەروو دەبیتەوە . وخۆی لە بەرامبەر حەتمیەت و موتلەقی شوناسی لۆکالیانەی جیاواز وفرەدا دەبینیتەوە.

سەرپیکەوتنی گلوبالیزمیشن لە هەموو جیهانەوە نیە. لە مبادەرەی هەموو کۆمەلگەکانی جیهانەوە نەبووە. لەیەك دەستە کۆمەلگەو یەك پرۆژەوە هاتووە کەهی خۆرئاوایە[٢٥]. ئەم مەیلەی ((گلوبالیزمیشن))یش بۆ خۆشوناسیکردنی جیهانیانە و بانگەشەکردنی شوناسی جیهانانەی ، پیشینەیەکی لای خۆرئاوا هەیە. کە هەمیشە و لە دوای رینسانس و رۆشنگەریەوە مۆدیلەکانی خۆی وا تەرحکردووەو تەرحدەکات کە مۆدیلیکی جیهانیە. و دەبیت هەموو جیهان مۆدیلەکەی ئەو بنووسیتەوە و ئەزموون و بەرجەستە بکات.

ئەگەر خۆرئاوا بە نزیکەی چوارسەدە پیش هەر شوینیکیتری جیهان توانیبیتی شوناسگوری کۆمەلگە وتاکی کۆمەلگە بکات لە میتافیزیکیەتەوە بەرەو ئەقلانیەت . وئەمجا لەرەوتی ململانیی نیوان مەعریفەو دەسەلاتداو سەرکەوتنی دەسەلات بەسەر مەعریفەدا توانیبیتی ئەم ئەقلانیەتە بەئایدیۆلۆژی بکات. وئیستاش بتوانیت بە هۆی هیزداریە ئابووری و زانستی و تەکنۆلۆژیەکانیە ئەم شوناسە ئایدیۆلۆژیەی بەرەو شوناسیکی بالاتربەرەو ((زانین)) و ((تەکنۆلۆژیا))، بەرەو ((کۆمەلگەی زانین – کۆمەلگەی تەکنۆلۆژیا)) بگۆریت . و ئەم تواناداریەی لە هەناوی پرۆژە کۆمەلگەییە ئایدیۆلۆژیەکەوە، ((دەولەتی خۆشگوزەران))، هینابیت کە پیدراوو بەرهەمی مۆدیرنەو مۆدیرنیتە. بەرهەمی ئیشکردنی

مەعریفی ونەقلانیانەی خۆرئاوایە لەسەرخۆی ، لەسەر کۆمەڵگەو مێژووو لەسەر کولتووری خۆی.

ئەگەر خۆرئاوا لە پای شکستێکەوە کەوتبێتە پرۆژەسازی دەوڵەتی خۆشگوزەران، یان ئەم پرۆژەسازیە ئایدیۆلۆژیەی پرۆژەی دوای شکستێك بێت. شکستی دەسەلاتڕۆیشتنی کۆلۆنیالیزمی جیهانانەی و قوتبوونەوەی بەرامبەرێکی بەهێزی کۆمۆنیزمی. ئەوا ئێستا لەگەڵ سەردەمیبوونەوەی ئەم دەسەلاتڕۆیشتنە جیهانیەی بانگەشەی هەڵتەکینی ئەم پرۆژەیە و دەستبەرداربوون لەم پرۆژەیە دەکات. باسی ئەوە ئەکات کە (( دەوڵەتی خۆشگوزەران هەرشەیە بۆ ئایندە))[٣٦]. و ئەمە بەزەرورەتی سەردەمی جەنگی سارد پێناسەدەکات کە ئیتر بۆ ئورووپا دەستنادات و (( لەسەروو تواناکانی ئەم کیشوەرەوەیە))[٣٧] و دەبێت وەك (( رووداوێکی ڕاگوزەر لە مێژووی ئابوریدا))[٣٨] تێبپەرێنرێت.

پێموایە پرۆژەی دەوڵەتی خۆشگوزەران بۆ خۆرئاوا ئەگەر پای شکستی کولونیالیزمیانەش بووبێت سەرکەوتنێکی مەعریفیە بۆ کۆمەڵگە بەبەراورد لەگەڵ دوو دەستە کۆمەڵگەکەیترو دوو پرۆژە کۆمەڵگەییەکەیتر. لێرەوە دەکرێت بێینە سەرباسی دوو پرۆژە ئایدیولوژیەکەیتر. بەر لە هەرشتێکیش دەبێت ئەوە بلێین کە گلوبالیزمیشن بەرهەمی ئیشکردنی کۆمەڵگەکانی ئەم دوو پرۆژە یە نیە . نەك هەر ئەمە بەڵکو گلۆبالیزمیشن کۆمەڵگەکانی ئەم دوو پرۆژەیەی لە بەرامبەر خۆیدا بەلۆکاڵیزمیشن کردووە، لەبەرامبەر خۆی دایناون.

لە خۆرهەلات ، لە جیهانی کۆمۆنیزمی، پرۆژە کۆمەڵگەییە ئایدیۆلوژیەکەی پرۆژەی پای سەرکەوتنە. بەلام سەرکەوتنی سیاسیانەی ئایدیۆلۆژیا نەك سەرکەوتنی مەعریفیانەی کۆمەڵگە . بەوتایەکیتر، پرۆژەی ئیشکردنی ئایدیۆلۆژیایە ، نەك ئیشکردنی مەعریفە ، لەسەر کۆمەڵگەو لە سەر کولتوورو لەسەر مێژوو . لێرە مۆدێرنەو مۆدێرنیتە ئایدیۆلۆژیانەیە، و لە فەرمانەکانی ئایدیۆلۆژیاوە بەرهەمدێن نەك

بەرهەمی گەشەی کۆمەڵگەو ڕسکاندنێکی مەعریفی ئەم گەشەکردنە یان ئەم گەشەسەندنە. هەموو پرۆژەیەکی ئایدیۆلۆژیاش، هەموو ئیشکردنێکی مێژوویی ئایدیۆلۆژیش. ئەگەر بە دیوێکیدا مۆدێرنەی ئابوری ـ تەکنیکی بێت، ئەوا بەو دیومیتریدا مۆدێرنیتەیەکی ئایدیۆلۆژیانەیە. ئەگەر بە دیوێکیدا گەشەسەندن و هەڵکشانێکی ئابوری بێت ، ئەوا بەودیومیتریدا داخستنی سیاسی و سستمی تۆتالیتاریزمی سیاسیە. بەتایبەتیش بۆ تیۆرە ئایدیولوژیا چەپەکان کە لە بەرامبەر خۆرئاواو ئایدیۆلۆژی لیبریالیزمی دیموکرسی، و وەك ئەڵتەرناتیفی ئەم ئایدیۆلۆژیایە خۆیان تەرحدەکرد.[29] لێرە کۆمەڵگە بە فەرمانەکانی ئایدیۆلۆژیا و لە تیڕوانینی ئایدیۆلۆژیاوە کەوتە ئیشکردن لەسەر خۆی ، واتە ئیشکردنێك کە لەدەرەوەی ڕەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵگەو پێداویستیەکانی ئەم گەشەسەندنەوەیە . ئیشکردنەکانی حاڵەتەکانی ئاوەهاش تاکلۆژیکە و یەکتاراستەکردن و یەکڕەنگکردنی کۆمەڵگەیە. سەرپێخستنی یەکێتی و تەبایبوونێکی کۆمەڵایەتیە کە زۆرتر سەپاندنە. ونارامی و ئاشتیەکی کۆمەڵایەتیە کە لەڕێی زەبروزەنگەوە جێگیردەکرێ. و بەواتایەك، لۆژیکێکە بۆ داپۆشین و پەردەپۆشکردنی جیاوازیەکان ، بۆ سڕکردنی جیاوازیەکان . و جێنشینکردنی وەهمی فرتکردن و چڕکردنی جیاوازیەکان. و کورتکردنەوەی هەموو حەقیقەتەکان و لۆژیکەکانە لە یەك لۆژیکدا .[30] واتە ئیشکردنێك زۆرتر نەفیکردن و سڕکردن و چڕکردنە لە ڕێی زەبروزەنگێکەوە – عنف - کە زەبروزەنگی دەوڵەتە.[31] ئەویش بەتەکاندن وراستتر هەوڵی چڕکردن و فرتکردنی هەموو شوناسەکانی پێشخۆی. و شوناسڕیژیەکی تویّ لە پنتێکەوە کە ڕەنگریژییەکی نوێیە بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگەیەك کە پشتەوەی نیە! و لە هەموو رایەڵبەندیە پشتەوەییە مێژووییەکانی دەپچڕێنرێ. و نامۆو نەناسیدەکات بەکۆمەڵگەکانیتر و تەنانەت بەپێشینەی خۆشی.

لە جیهانی سێو بەتایبەتیش لە جیهانی ئیسلامی شوناسڕێژکردنی ئایدیۆلۆژیانە سەرەڕای ئەوەی مەرجەعێکی لە سەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیانەی ئورووپای خۆرهەڵاتدا. و لەخۆبەرامبەر و خۆ ئەڵتەرناتیفکردنی بلۆکی خۆرهەڵات بۆ خۆرئاوا هەبوو. پاڵدانەوەکانی زەرورەتبوونیشی لە وێوە بوو کە هێزێکی داگیرکەر -- کۆلۆنیالیزمی - تەواوی کۆمەڵگە ونەتەوەو نیشتمانێکی خستبووە بازنەی بەرگری وبەرەنگاریانەوە. لێرە لەم کۆمەڵگەیانەدا سەرکەوتن سەرەڕای ئەوەی سەرکەوتنی مەعریفیانە نیە، سەرکەوتنی سیاسی و کۆمەڵگەییانەی ئایدیولوژیاش نیە. سەرکەوتن سەرکەوتنی نیشتمانێك و نەتەوەیەکە کە داگیرکردن بەرەو زیاتر خۆ پەنادانەوەی کولتووریانە و پاڵدانەوەی کولتووریانە، و لەمیشەوە بەرەو ئەندێشەکانی تەقدیسکردنەوە و بەمیسۆلۆژیکردنەوەی کولتووری بردووە. هەر بۆیەش ئایدیۆلۆژیا و شووناسی ئایدیۆلۆژیانە دەبوو بە دەزوولە ووردەکانی کولتووردا گوزەربکەن. ونەك هەر لە بارەی کولتوورەوە هیچ قسە و پرسیارێکی جەوهەری وهیچ گومانێکیان نەبێت. بەڵکو بۆ کۆمەڵایەتیبوون و کۆمەڵگەییبوونیشیان پەنابەنەوە بەر کولتوور. و سەرلەنوێ تەقدیسکردنەوەی کولتوور. کە ئەمەش بۆ خۆی خۆماڵیکردنێکی ئایدیۆلوژیایە، ڕۆشنترین نموونەی ئەمەش ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزمە کە ئەگەر خۆماڵیکردنێکی تەواوەتیانەی ئاینیانەش نەکرابێت ، خۆماڵیەکی کولتووریانەکراوە . ئەمە سەرەڕای نەتوانینی ئەم ئایدیۆلۆژیایە بۆ تێپەڕین لەسەرزەکانی "دەوڵەت ـ نیشتمان"ە وە بەرەو سەرزەکانی "دەوڵەت ـــ نەتەوە". هەرچی ئایدیۆلۆژیاکانیتریشە وەك سۆسیالیزمی و لیبرالیزمی لەڕووی پێگەو بنکەی کۆمەڵایەتیانەوە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نەڕسکاوەو لەناویەکتریدا بەئاسانی دەناسرێنەوە، و لەمەشەوە بەشێوەیەکی پۆپۆلیزمیانەی وەها بەرێخراون و بەکۆمەڵایەتیکراون کە زۆر جیاوازو جیایە لەو تیزو فۆرمەی کە لەشوێنی خۆی هەیەتی ، واتە لەخۆرئاوا. هەر بۆیەش لێرە ستەمە باس لە

مۆدێرنیتە بکرێت.[32] ئەوەی لەمبارەشەوە ئەندێشە دەکرا جگە لە وەهمێکی ئیمکانی فریودەرانەی مۆدێرنیتەی ئایدیۆلۆژیانەی بلۆکی خۆرهەڵات شتێکیتر نەبوو. لێرە ئەوەی لە مۆدێرنەو مۆدێرنیتە رسکاو وەرگیرا جگە لە یۆتۆپیای ((تنمیەی ئابوری)). دەستە بەربوونی ئەو کەرەسەو میکانیزمانەش بوو کە سستمێکی توتالیتاریزمی پێدادەمەزرێ و دەپارێزرێ. ئەویش بە هاوردنێکی ((فتووبەند))یانە لە بلۆکی خۆرهەڵاتەوە: (( حزبی سیاسی جەماوەری و ئایدیۆلۆژیای رادیکالیستی – پۆپۆلیزمی و دەزگای پۆلیسیی توندوتۆڵ. و تەکنولوژیای سەربازی و هونەرەکانی مەشق و راهێنانی سەربازی. و بنەماکانی هەڵگەرانەوەی سوپا لەگەڵ. وریکخستنەوەی سوپا وەك دەزگایەکی پۆلیسیی زۆربۆهێنان و پەلاماردان.))[33]

لێرەوە، لەم کورتە باسەی مێژووی ئایدیۆلۆژیانەی کۆمەڵگە لۆکاڵیزمییەکانەوە، دەتوانین لەو دۆخە کۆمەڵگەییەی ئێستای خۆشوناسیکردنەوەی لۆکاڵیانە بگەین، کە هەم داکشانی کۆمەڵگەیە و هەم خەسڵەتێکی (( بەرەنگار))یانەی دراوەتێ وەهیە. بەلام ئەمە، ئەم شێوە خۆشوناسیکردنەوە لۆکاڵیزمییە. راڤەکردنیی تەنها لەسەر ئەم پێشینەو دۆخ و تایبەتمەندێتیە کۆمەڵگەییە راگیرنابێت. لەمەدا دەبێت گەرانەوەیەکیش هەبێت بۆ دۆخی جیهانیی. لەمەشدا ئەگەر بۆ خۆرئاواو لە تافی دوای ئایدیۆلۆژیادا خۆشوناسیکردنەوە دەرهاویشتەی هەڵکشانی کۆمەڵگەبێت. ولەم خۆشووناسیکردنەوەیەدا خۆرئاوا لە بەرامبەر هیچ زۆربۆهێنانێکی دەرەکی و هیچ ((منافس))ێکدا نەبوو بێت. وتەنانەت ئەم هەڵکشانەی هێزدارییەکی وەهایدابێتێ کە مەیلی ئەوەی هەبێت، و هەوڵی ئەوە بدات و بانگەشەی ئەوە بکات . کە ئەم شوناسرێژیە جیهانییەی گشتگیری جیهان بکات، و گشتگیری جیهانبێت. و وەك دواپلەو بالاترین پلەکانی شارستانیانەی مرۆڤایەتی پێناسەی ئەم شوناسرێژییە نوێیەی بکات، هەر ئەمەش بەگوێی جیهاندا بدات. ئەوا کۆمەڵگەکانیتر، کۆمەڵگە

لۆكاڵیزمییەكان، لە خۆشوناسیكردنەومیان نەك هەر لەم دۆخی هەڵكشانە بەهرەمەندنین، و بەرامبەری ئەمە لە داكشاندان. بەڵكو لە بەرامبەر ((منافس))ێكیشدا خۆشووناسیدەكەنەوە كە سەرسەختانە دەیەوێت شووناسی خۆی بسەپێنێ. و لە هەموو برگە و رەگەزەكانی گلۆبالیزمشدا ئەم شوناسرێژیەی ئامادەیە، و خودی دیاردەی گلۆبالیزمشنی كردۆتەوە حەقیقەتی ئەم شووناسرێژیەی، و كردۆتە میكانیزمی ئەم سەپاندنە. بە واتایەكیتر، لەم كۆمەڵگەیانەدا خۆشوناسیكردنەوە گرفتێكی بەرامبەر وەستانی هێزێكی دەرەكیە. كە هەم ناچار بە تەكاندن و دۆڕاندنی شووناسێكی كردووە. كە زەمەنێكە بەئارامی و بێپرسیارو بێهیچ گرێوگۆڵێەك خۆی پێتایبەتمەندكردوومو خۆی پێ لەوانیتر جیاكردۆتەوە. و هەم دەیەوێت شووناسی خۆی بسەپێنێت. هەر بۆیەش لێرە خۆشووناسیكردنەوە بەهەمان فۆرمی سەردەمی كۆلۆنیالیزمی ((بەرەنگاری))ئەمو پەنادانەوەی ناچاریانە بۆ شووناسە كۆنەكانە: كۆمەڵگەكانی جیهانی كۆمۆنیزمی لە خۆشوناسیكردنەومیاندا، ناگەڕێنەوە سەر كۆمۆنیزم و چەپڕەویبوون، بەڵكو رێك بۆ پێش كۆمۆنیزم، بۆ ناسیونالیزم و راستڕەویبوون. كۆمەڵگەكانی جیهانی (( سێ))ش ناگەڕێتەوە بۆ ئەزموونكردنەوەی ئایدیولوژیایەكیتر و پروسێكیتری خۆماڵیكردنەوەی كولتووریانەی ئایدیولوژیا، بەڵكو رێك بۆ پێش ئایدیولوژیا. بۆ كولتوور و پرۆسەی بە ئایدلوژیكردنەوەی كولتوور. بەواتایەك لەمەوە دەتوانین ئەوە بڵێین كە خۆشووناسیكردنەوە لوكالیزمییەكان بە هەموو تیزەكانیەوە، بەهەموو خۆپەنادانەومو پاڵدانەوە ئایدیۆلۆژی و كولتووریەكانیەوە، گوزارشتن لە داكشان، داكشانی مەعریفی. و هەوڵ بۆ هێنانەوە مەیدان و كاراییكردن و ئەكتیفكردنەوەی كۆمەڵایەتیانەی سستمە مەعریفیە پێشمۆدێرنیتەكان و میتۆدە مەعریفیە پێشمۆدێرنیتەكان.

دواجار دەكرێت ئەوە بڵێین كە لە جیهانی ئێستادا بە هەمان تیژڕەوییەكانی هەڵكشانی مێژوویی كۆمەڵگە گلۆبالیزمییەكان – گلۆبالیزمیشن –، داكشانی مێژوویی كۆمەڵگە لۆكاڵیزمییەكان – لۆكاڵیزمیشن– هەیە. كە ئەزموونكردنەوەی نووسینەوەی كلاسیكیانە و پێشمۆدێرنیتەیی و پێشگلۆبالیزمیشنانەی مێژووە .

ئێستا لە ناوبریارانی جیهانی سێی جاران، لە كۆمەڵگە لۆكاڵیزمییە پلە (( دوو))ەكاندا، و بەتایبەتیش بریارە چەپە عەرەبەكان، ئەو تێروانینە باوە كە گلۆباڵیزمشین بە فۆرمێكیتر لە كۆلۆنیالیزمی شوونسیدەكەن. و لەمەدا هاوتێروانینی كولتوورگەرەكانن. و پێكەوە یان بەجیاجیا سەرقاڵی كۆكردنەوەو یەكخستنەوەی توخم ورەگەزەكانی سەنگەرلێدانی مەعریفی و كۆمەڵگەیین دژ بە گلۆبالیزمیشن ، و لە هەوڵی زیندوكردنەوەی زەمەنی بەرەنگاری و بەرگری دژە كۆلۆنیالیزمیدان. بەلاّم لەوێوە لە كولتوورگەرەكان جیادەبنەوەو رەخنەشیان لێدەگرن، كە كولتوورگەرەكان دەیانەوێت و بانگەشەی ئەوە ئەكەن، پەنادانەوەی ((رەسەنبوونەوە))ی كۆمەڵگەبەرەو كولتووربێت !.[٣٤] وئەمە بە تیزێكی ((دەرچوون لە مێژوو))[٣٥] یان ((مەیلی چەواشەكاریانەی بەرەو رابردوو))[٣٦] دائەنێن. وەلێ ئەوەی لێرەدا و لە تێڕوانینی ئەم بریارانەدا وونەو بەهۆی ئەو تێزی بیركردنەوە میراتبووە چەپڕەویانەیانەوە، ناتوانن پەیبێبەن، چونایەتیەكانی سیستماتیزەكردنی فكریانەی ئەم تێروانینەیانە كە جۆرێك ((ئیشكردنی مێژووی)) ئەزموونبكات بەرەو تێپەرینی لۆكاڵیزمیبوون، هەڵكشانی كۆمەڵگە!!.

وەهەمێك، رێگەلەخۆداخستنێك كە ئەم بریارانە لەبەردەم خۆیانی دادەنێن ئەوەیە كە دەڵێن: لە كۆمەڵگەكانی ئێمەدا تا ئێستە دوو تێز، دوو مودێلی (( ئیشكردنی مێژوویی)) ئەزموونكراوە ((كولتووریی)) و ((ئایدیۆلۆژیی)). و ئەگەر ئایدیۆلۆژیا بەرەو ئەم شكست و قەیرانە مێژووییەی راپێچكردووین. و بۆ هەڵكشانی مێژوویی هیچی لەمە زیاتر

پێنیەکە تا ئێستا فەراهەمیکردووە. ونەگەر کولتووریش بەو ئەنتێشە میسولوژیەیەوە بەرەو دواوەمان راپێچدەکات و بۆ داکشانی زیاتری مێژوویی و مەعریفیانەی کۆمەڵگەیە. ئەوا (( گلۆبالیزەیشن))یش داوای دانانی چەکەکانمان لێدەکات ((بانگهێشتی ئەوە دەکرێین تا بەم یان بەوشێوەیە چەکەکانمان دابنێین))[٣٧] وخۆ بەدەستەوە بدەین !. ئەمەش بۆخۆی تراژیدیایەکە ستەمیی سەردەرهێنانەوەو سەرڕاستکردنەوە وێنادەکات . لێرەوە ئەو پرسیارە سادەیە دەرسکێ: ئەی چارەسەر چییە ؟!. وەڵامی ئەم پرسیارە و ڕوونکردنەوەی زیاتری ئیشکالیەتەکانی ئەم وەڵامدانەوەیە بۆ بەشەکانیتری ئەم نووسینە دائەنێم. بەر لە کۆتاییهاتنی ئەم بەشە و لە کۆی باسەکانی ئەم بەشەوە. وەك سەرەتایەکی رەنگرێژکردنی ئاراستەی کۆچ کە دیسانەوە ڕوونکردنەوەکانی دەسپێرمە بەشەکانی دوایی ئەم نووسینە. دەکرێت بەر چاووروونیەکمان لابێت لەوەی ڕەوت و ئاراستەی کۆچ لە کۆمەڵگە لۆکالیزمییەکانەوەیە بەرەو کۆمەڵگە گلۆبالیزمییەکان. لەکۆمەڵگەکانی کارایی و بەریەککەوتنی تیژەکانی بەرەو داکشانبردن و چەقبەستوویکردنی کۆمەڵگەوە بەرەو کۆمەڵگەکانی هەڵکشان.

## بەشی چوارەم

### ئیشكالیاتەكانی كۆمەڵگە لۆكالیزمیەكان

لەم بەشەوەو لەدوابیەكانی ئەم باسەوە هەوڵدەدەم گەر بەشێوەی دەرگالێدانی دەرگاكانیش بووە، روونكردنەوەیەك سەرپێبخەم سەبارەت بەهێشینەو ریشەو سەرەداوەكانی تراژیدیای كۆمەڵگە لۆكالیزمیەكان، بەتایبەتیش كۆمەڵگەكانی هاوچەشن و هاوشێوەی كۆمەڵگەی خود كە بارگاوییە بە ئیشكالیاتێكی پێكەوە هەڵكردن و پێكەوە هاتنەوەی شتە ناتەباو نەسازەكان. ئەویش لەو فۆرم و شێوەیەدا كە ئایدیۆلۆژیاو ئەندێشەكانی رێنسانس ـ بەتایبەتیش رێنسانسی عەرەبی ـ لەدوادواكانی سەدەی نۆزدەوە بناغەرێژو رەنگرێژیانكردووە. و كۆمەڵگەیان لەزەمەن و دۆخێكدا قەتیسكردووە كە بەرچاوروونی نەك بەرامبەر ئاراستە بەپلانەكان، بەڵكو بەرامبەر ئاراستە سروشتیەكانی بەرەوپێشەوەچی خۆشی نەبێت. و پێشبینی بۆ هیچكام لەپێشهاتەكان و تەنانەت هەنگاوە خۆرسكیەكانی خۆشی نەبێت. تراژیدیایەك كە هەموو ئەو تێزانە ئەزموونەكرێن و بەریەكدەكەون و لەبەرامبەریەكدیدا خۆشوناسیدەكەنەوە، كە تێزگەلێكن بۆ زیاتر تەمومژكردن و لێڵكردنی بینینەكان و خۆنەدۆزینەوەی كۆمەڵگە، و دواجاریش هەنگاوهەڵگرتن بەرەو رابردوو.

بەهەمان جیاوازی روناكانی خوێندنەوەی گلۆبالیزمیشن: ((كۆمەڵگەكانی گلۆبالیزمیشن)) یان ((كۆمەڵگە گلۆبالیزمیەكان))، رونیایی جیاوازیش بۆ خوێندنەوەی لۆكالیزمیشن: (( كۆمەڵگەكانی لۆكالیزمیشن)) یان (( كۆمەڵگە لۆكالیزمیەكان))، بۆ ناسینەوەی پەیوەندیەكان و پێكدیهابەندو پێكدیرایەڵبەندبوون و بەرامبەر یەكدیوەستانەكانی (گلۆبالیزمیشن) و (لۆكالیزمیشن)، لەمەشەوە ناسینەوەی گرفتەكان،

ئیشـکالیەتەکانی هەریــەك لــە کۆمەڵگــە لۆکاڵیزمییــەکان و کۆمەڵگــە گلۆبالیزمییەکان، هەیە.[٢٨]

کۆمەڵگە لۆکاڵیزمییەکان لە ئێستەدا لەبەردەم ڕووبەڕووبوونـەوەو خۆداڕشــتنەوەیەکی چارەنووســازدان. چۆنایەتیەکانیتێگەیشــتن لــەم ڕووبەڕووبوونــەوە و خۆداڕشتنەوەیە. تێگەیشـتن لـە خۆئامـادەکردن بـۆ یەکلاییکردنـەوە وساغکردنەوەی ئـەم ڕووبەڕووبونـەوە و خۆداڕشتنەوەیە، و ئیشکالیات و گرفـت و بەربەسـتەکانی ئـەم خۆداڕشتنەوەیە، و ئـەو فـەزا مـەعریفی و کۆمەڵگـەیی و جیهانیـەی کـە ئــەم خۆداڕشــتنەوەیەی تیــا دەنووسرێتەوە. گرفتێکە کە کۆمەڵگە لۆکاڵیزییـەکانی لـە بـەردەم دووریـان، یـان چەندڕیانی بڕیـارو فۆرمــی تێگەیشـتن و ناسـینەوەی ئـەم گرفتـە، و هەندێك جاریش گوزارشتی جیاواز بۆ یـەکرونیای تێگەیشتن و ناسینەوە داناوە. ئـەوەی مـن لـێرەدا دەمــەوێت لەســەری ڕابوەســتم هــەم رونیــا جیاوازەکــان وهــەم گوزارشــتکردنە جیاوازەکــانی یەکرونیایــە بــۆ ئــەم خوێندنەوەو تێگەیشتن و ناسینەوەیە.

*　　　　*　　　　*

هــەروەك پێشــتر ئاماژەمــان بــۆ کــرد، کۆمەڵگــەکان لــە تــافی ئایدیۆلۆژیــادا بــە پشــتەوەیەکی مێژوویــی و کۆمەڵگــەیی جیــاواز و بەرهەمەندو ئامانج و گرەوی کۆمەڵگەیی جیاوازەوە ئامادەی ئەم تافە بـوون. و لەمەشەوە بە مێژوونووسـینەوەیەکی جیاواز لـەم تافـەدا گوزەریـانکرد. و لـەپای تێپـەڕینی ئــەم تافــە و شکسـتی ئایدیۆلۆژیـاش دەرگـیری قــەیرانی جیـاواز، سـتراکتۆری جیــاوازی قــەیران و فۆرمــی جیــاوازی ڕۆچوونــی کۆمەڵگــەیی و کۆمەڵایــەتی ئــەم قەیرانــە بوونــەوە. بــە دوو ئاراســتەی هەڵکشان یان داکشانی کۆمەڵگە. وفۆرم و ئاستی جیاوازی ئـەم هەڵکشـان و داکشانە مێژووییەیە.

بنەرەتیترین گرفت و نیشکالیاتی ئێستەی کۆمەڵگە لۆکاڵیزمییەکانیش پرسی چۆنایەتی ((سەردەمیبوون و ڕەسەنیبوون))ە[٣٩]:
چۆنایەتی سەردەمیبوون بێئۆراندنی ڕەسەنێتی، و چۆنایەتی ڕەسەنیبوون بێدەرچوون لەسەردەمێتی.

ئەگەر لە تافی ئایدیۆلۆژیادا، لەسەردەمی هەژموونگەری جیهانیانەی ئایدیۆلۆژیادا، پرسی ((سەردەمیبوون)) لێکدانەوەیەکی ئاسان و سادە وبێگرێوگۆڵی هەڵگرتبێ و بۆکرابێ، و بەئاسانی لای بەشی هەرەزۆری خەڵکی سادەش لێکدرابێتەوەو تێگەیشتن بەرامبەری هەبووبێت. بە تایبەتیش لە کۆمەڵگەکانی وەك ئێمەدا. و بەکورتی بە ئایدیۆلۆژیبوون وئاداری سەردەمیبوون بووبێت: لە((دامەزراندنی حزبی ئایدیۆلۆژی، دەسەڵاتی سیاسی ئایدیۆلۆژی، دەوڵەتی ئایدیۆلۆژی، دروستکردنی خەڵکی ئایدیۆلۆژی، شەڕوململانێی ئایدیۆلۆژی، دۆستایەتی و هاریکاری ئایدیۆلۆژی)) دواتریش و بەکورتی (کۆمەڵگەی ئایدیۆلۆژی!!).
ئەوا دوای شکستی ئایدیۆلۆژیا ئەم پرسە جارێکیتر سەرهەڵدەداتەوە.

لەسەردەمی ئایدیۆلۆژیادا، نەتەوەکان ، کۆمەڵگاکان ، نە پرسی سەردەمیبوون نەپرسی ڕەسەنیبوونیان بەڕادەی ئێستا زەقنەبووە، و تەنانەت دەگرێت بڵێین ئایدیۆلۆژیا ئەم پرسەی لە پشتی خۆیەوە شاردبۆوە ، و خەفەکردبوو. هیچ کەسێك ، هیچ گروپێکی نەتنیی و تەنانەت کولتووری ، جگە لە سەلەفییە ئسووڵیەکان پرسیارێکی ئەوتۆی لە بارەی ڕەسەنیبوون و سەردەمیبوون ، لەبارەی یەکەمێتی کامەیان . و بناغەییبوونی کامەیان بۆ ئەویدی نەبوو[٤٠]، هێزێکی بەهەژموون و تیژڕەو و دەسەڵاتڕۆیشتووی جیهانیی وەهاش نەبوو ، وەك ئێستای گلۆبالیزمیشن کە دوانەی ((ڕەسەنیبوون - سەردەمیبوون)) و پرسییەکەمێتی کامەیان بخاتە ژێر پرسیارەوە. و لەمەشەوە ئیشکالیاتی ئەم دوانەییە و فۆرم و ڕوئیای جیاواز بۆ تێگەیشتن و خوێندنەوەی ئەم

ئیشکالیاته و بــۆ ڕەوانـدنـــەوەی پرســیارەکان ، پرســیارەکانی پــای ئـــەم خوێنـدنـەوەیه . سەرهەڵبدات.

خـەڵك و كۆمەڵگەكان، نەتـەوەكان، بەتايبـەتيش لـە جيهانی سـێ - كە زۆرتر بابـەتی ئـەم باسـيە - لـە يۆتۆپيـای ئـەوەدا چەقێندرابوون، كە دەتوانـن بـەهۆی ئايديۆلۆژيبوونـەوە سـەردەمييبن، و بـەهۆی ئامـادەيی و ئاســـانی مـمارەســـەكردنی بێگرێوگـــوڵ وبێبەربەســـتی بيرورەفتـــاری كولتووريانـــەش ڕەســـەنيبن. دەتوانـــن بێدۆڕانـدنـــی ڕەســـەنێتی و بێـــهيچ پرسيارێكی ئـەوتۆ لـە ڕەسـەنێتی كولتوورپانـە، بەخـەونێكی ئـارام لەســەر كولتوورو لەناو شەمەندەفەری (( مۆدێرنەو تەنميه))ی ئايديۆلۆژيانە نـەك هەر سەردەمیبن بەڵكو بگەنە سەردەمێتی باڵا، بگەنەوە بە خۆرئاوا !.

بـەڵام شكستی ئايديۆلۆژيـا ئـەم خـەوە ئارامـەی زڕانـدن و لەبـەردەم حەقيقـەتی ئـەوەی دانـان كـە : سـەردەمێتيبوونيی بـەهۆی ئايديۆلۆژيـاو ئايديۆلۆژيبوونـەوە جگـە لـە يۆتۆپيايـەك، لـە درۆ، درۆيـەكی گـەورەی مێژوويی شتێكيترنەبووە و نـابێت، وهيـچ تـێزێكی سـەردەمیبوون لەهـەر شوێنكاتێكی مێژووييانەشدا بێت بێپرسيار نيه لە ڕەسـەنێتی. لەمـەوە ئـەم كۆمەڵگەيانـە جارێكيـتر دەرگيری ئـەو گرفـت و ئيشـكالياتانە بوونـەوە كـە جۆنايـــەتی لـــە يـــەككاتدا هاوشـــانيكردنی (( ســـەردەمێتيبوون و ڕەسـەنێتيبوون))ە. ئـەوەی پرسـيارەكانی ئـەم جۆنايەتيەشـی جديـترو جەوهەريتر كرد شكستی تێزی سەردەمێتيبوونی سۆڤێتی بـوو، كە پـاش هەڵكشـانی كۆمەڵگـەش بـۆ تـافی پيشەسـازی كـەچی شكسـتدێنێ و سەردەمێتيبوونی دەكەوێتە ژێر پرسيارەوە.

ئەگـەر پرسـی سـەردەمیبوون و ڕەسـەنيبوون بـۆ خۆرئـاوا، بـۆ كۆمەڵگەكانی گلۆباليزمیشن، بە ئاسانی يەكلايی بووبێتەوە و هيچ گرفتێك لە خۆنەگرێت. و سەردەمێتيبوونی گلۆباليزمیشن بە تۆكمەيی خۆی لەسـەر ڕەسەنێتی كۆمەڵگەكان ڕاگرتبێ. و بۆ ئەمـە هـەم پاشخان و پشتەوەيەكی لە مۆدێرنـە و مۆدێرنيتـە، و لـە ليبريـاليزمی ديموكراسی، و ئـابووری بـازاڕ

وئازادی ئەم ئابوریە، هەمیێت. و هەم لە دەسەلات و توانایەکی دارایی و ئابوری وتەکنۆلۆژی وزانستی وەهاش لە ئێستەدا بەهرەمەندبێت، کە لەئێستەدا نەک لای هیچ کۆمەڵگەیەك و بەشێکیتری جیهان نیە. بەڵکو نەخۆرئاوا خۆی ونەهیچ کۆمەڵگەیەکیتریش لە مێژووەکانی پێشووتردا خاوەن توانایەکی ئاوەها نەبوونە. ئەگەر لە توێی هەموو ئەمانەوە پێداگریەکان و خودشوناسیکردنەوەکانی ئەم کۆمەڵگەیانە تەنها راوەستان لەسەر سەردەمیبوون، لەسەر سەردەمیبوونێکی گلۆبالیزمیشن بێت. وتەنانەت بانگەشەی رەسەنیبوونەکانیشی هەر گلۆبالیزمیشن بێت. ئەوا بۆ کۆمەڵگەکانیتر، بۆ کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکان وەهانیە. لێرە سەردەمیبوون و رەسەنیبوون پرس وگرفتێکی بنچینەییە. لێرە، لەم کۆمەڵگەیانەدا، بەهۆی دۆڕاندنی سەردەمێتیبوونە پێشووەکان، و ئاشکرابوونی تێزمیۆتۆپیاکانی سەردەمێتیبوونە پێشوەکان، و خۆدەرخستن وهێرشە بەهەژموونەکانی تێزی سەردەمێتیبوونی گلۆبالیزمیشنانە، و لەمەشەوە بەهۆی سەرهەڵدانی فۆرمی جیاوازی تێگەیشتن لە سەردەمێتیبوون ورەسەنێتیبوون و ئیشکالیاتەکانی چۆنایەتی پێکەوەهاتنەوەو جووتکردنی مێژوویی و کۆمەڵگەیی وەمەعریفیانەی ئەم دوانە، وپێشداوەری و پێداگیری جیاواز بۆ لە پێشبوونی کامەیان و لەپاشبوونی کامەیان . کۆمەڵگە دەرگیری لێکترازان و ململانێ و شەڕی کۆمەڵایەتیانەی وەهابوو کە مەگەر تەنها بە پاڵدانەوەیەکی پێشمۆدێرنیتەیی و بە ئەحکامەکانی میتافیزیکیەت و تێروانینی تۆتالیتاریزمیانە واتایەکیان بۆ بدۆزرێتەوە و پاساوبدرێنەوە . لێرە، بەگشتی و تێزی باوو وبالادەست ئەوەیە کە: رەسەنیبوون یەکەمێتیی هەیە، و لەرەسەنێتیبوونەوە سەردەمێتیبوون دەخوێندرێتەوە و بڕیاری لەسەرئەدرێت ؛ واتا ڕەسەنیبوونێکی ((بەرگری ))یانە بۆ سەردەمیکردنی بەرگری لە ڕەسەنێتی . یان تێگەیشتنێکی بەرگریانە لەسەردەمیبوون و ڕەسەنیبوون لە بەرامبەر گلۆبالیزمیشندا . وەلێ لەمەشدا دوو تێزیبوونێك ، دوو مۆدیلیبوونێکی خۆڕەسەنیکردنەوە هەیە

که کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکان دابەشی دوو دەستە کۆمەڵگە دەکات . یەکەم ، کۆمەڵگە لۆکالیزمیە پلە ((یەك))ەکان ، ئەو کۆمەڵگەیانەی گەیشتوونەتە پیشەسازیبوون بەڵام لە تێپەڕینی ئەمە بەرەو ((تەکنۆلۆژیا و زانین )) بوون شکستیان خواردووە . لەم کۆمەڵگەیانەدا بەهۆی دارشتنەوەی کولتووریانە لە لایەن ئایدیۆلۆژیاوە ، خۆرەسەنیکردنەوەیان ئایدیۆلۆژیانەیە . بە وتایەکیتر، فۆرمی باوو بەدەسەڵاتی خودرەسەنیکردنەوەی کۆمەڵگە ((بەکولتووریکردنی ئایدیۆلۆژیا))یە . دووەم ، کۆمەڵگە لۆکالیزمیە پلە ((دوو))ەکان ، ئەو کۆمەڵگەیانەی چەقیوو یا چەقێندراوی دۆخێکی گواستنەوەی بەرەو پیشەسازییبوونن . لەم کۆمەڵگەیانەدا ئەم فۆرمە ((بەئایدیۆلۆژیکردنی کولتوور )) یان ((بەئایدیۆلۆژیکردنەوەی کولتوور))ە . ئەمە لەپاڵ هەبوونی تارادەیەکی فۆرمی کۆمەڵگە لۆکالیزمیە پلەیەکەکان لەم کۆمەڵگایەنەشدا کە (بەکولتووریکردنی ئایدیۆلۆژیا)یە.

**کۆمەڵگەکانی بە ئایدیۆلۆژیکردنەوەی کولتوور**

بۆ پەیبردن بە بنەچەی مەعریفی و مێژوویی، ئامادەیی کۆمەڵگە بۆ ئەم مۆدیلە لە خودرەسەنیکردنەوە. دەبێت راگیربوونەکانمان لەسەر خودی کۆمەڵگە. لەسەر مێژووی ئەم کۆمەڵگەیانە بێت. لەم کۆمەڵگەیانەدا، و بەتایبەتیش لە کۆمەڵگەکانی جیهانی ئیسلامیدا، کە کۆمەڵگەی ئێمەش دەگرێتەوە. خەڵك و کۆمەڵگە ماوەیەکی دوورودرێژی مێژوویی بەو پەڕی ئارامیەوە وبێهیچ گرفتێکی ڕسکاندنی پرسیار وگومان لە رابردووی و لە ئیستەمیەکانی لەسەر ئەندێشە وڕۆشنبیریە کلاسیکیە کولتووریەکەی دەخەوت. تاکە پێشداوەریەکیش کە دەیکردو دەبوو بیکات و بەرجەستەی کۆمەڵگە و بیروباوەرو ئاکارە دەستەجەمعیەکانی بکات، و لەمەوە بەردەوامێتی مێژوونووسینەوە و لە مێژوودا مانەوەی ئەندێشە بکات. بەرهەمهێنانەوەی سکولاستیکیانەی ئەم ئەندێشەو رۆشنبیریە

کولتووریە بوو. کاتێکیش کۆلۆنیالیزم بەو توانا مەعریفی و مەتریالیە هەڵکشاوەی بۆ هێرش و داگیرکاری لەم خەوە ماوە درێژە ڕاپچڵەکاند، خۆی لەبەردەم پرسیارگەلێکی جدیی و جەوهەری وەهادا بینیەوە کە نەك هیچ ئامادەکاری و توانایەکی مەعریفی و کۆمەڵگەیی بۆ وەڵامدانەوەیان نەبوو، بەڵکو هەرگیز پێشبینی ڕووبەڕووبوونەوەی پرسیارگەلی وەهای نەدەکرد کە نەتوانێت وەڵامیان پێبداتەوەو وەڵامەکانی لای ئەونەبن. لەمە، لەم بەئاگاهاتنەوە وراچڵەکینەوە، تێگەیشت کە دنیا ئیتر هەر ئەو فەزایە نیە کە ئەو ئەندێشەی دەکرد، و فەرمانی ئەوەی پێدرابوو کە ئەندێشەی بکاتا. بەڵکو لەودیووی ئەم ئەندیشانەیەوە، لەودیووی حەقیقەتخوازی و موتڵەقخوازیەکانی ئەوەوە. حەقیقەت و موتڵەقیتیش هەمن وتەنانەت هێندە قەناعەتهێنەرو هێزدارن کە نەك هەر توانای بە ڕووداوەستانەوەیانی نیە. بەڵکو ناشتوانێت و مەعریفەی ئەوەشی لە بەردەستدا نیە وبەرهەمنەهێناوە کە پەیبەنەهێنی و بنەچەکانیان بەرێت. تێگەیشت کە ئیتر هەموو ئەندێشەکانی بۆ لە دەستدابوونی ((مبادرە))ی مێژوویی، و بۆ ئیحتواکردنی ئێستەییەکان و زەمانەتکردنی ئاسۆ ڕوونیبوونە ئایندەییەکانی دەکەونە ژێر پرسیارەوە. و فەرمانەکانی کۆلۆنیالیزم و حەقیقەتی کۆلۆنیالیزم بە ئاراستەی برستلێبڕینێتی بۆ نووسینەوەی مێژووی خۆی، و ئەندێشەکردنەکانی بۆ نووسینەوەی مێژووی جیهان ا. لێرەوە لەم ڕاچڵەکین و تێگەیشتنەوە کۆمەڵگە خۆی لەبەردەم بڕیارێکدا ڕاگرت کە (( بەرەنگاری)) و ((بەرگری))انە بێت. تاکە مەرجەع و پاڵنەوەیەکیشی بۆ ئەم بڕیارەی کولتوور بوو. کولتوور وەك یادەوەریکردنەوەی هەموو شانازی و سەروەریە ڕابردووەکانی. ولەمیشەوە هاوردنەوەی بناغەڕێزکردنی خۆرەسەنیکردنەوە و بڕوا بەخۆدانێکی ((بەرەنگار))یانە. و وەك سستمێکیش بۆ دەستەبەرکردنی یەکڕیزی و یەکێتی نەتەوە یان ئومە، بۆ بەرەنگاری و ئاماددەبوونی بەرەنگاری.

لەمەوە، لەم ئامادە کردنەوەو تەوزیفکردنەوەیەی کولتوور، لەم ئەرکپێدانی پەیامە بەرەنگاریە بە کولتوور، تەقدیسکردنی کولتوور ئاکامگیربوو. هەر ئەم ئەندێشەی تەقدیسکردنەوەیەش وایکرد جارێکیترو سەرلەنوێ کولتوور بە پرۆسێکی (بە میسۆلۆژیکردنەوەی مێژووە تایبەتیەکەیدا)[11] گوزەر بکات. کاتێکیش کولتوور بەم تێزە تەقدیسکردن و بەمیسۆلۆژیکردنە ئەبستراکت و کلاسیکیەیەوە نەیتوانی بگاتە ئاستی بەرەنگاربوونەوەی مەعریفیانەی خۆرئاوا. وبەرەنگار بوونەوەی کۆلۆنیالیزمی، ناچار کۆمەڵگە کەوتە وەرچەرخاندنی سستەم و پرۆسس وئەندیشەی قەردکردنەکانی، لە مێژووی رابردووی خۆیەوە بەرەو خۆرئاوا، لە کولتوورەوە بەرەو ئایدیۆلۆژیا. خواستنی ئایدیۆلۆژیا وەك دوا پێگەیشتنە فکریە سیاسیەکانی خۆرئاوا. لێرەوەیە کە بەرچاوورۆشنی ئەوەمان ئەبێت کە خواستنی ئایدیۆلۆژیا لەم دۆخەدا بۆ سستەمتیزەکردنەوەیەکی سیاسیانەی سەردەمیانەی بەرەنگاربوونەوەی کۆلۆنیالیزم بوو. بەرەنگاریەك کە پێشتر کولتوور دواهێڵەکانی نەخشکردنی کێشابوو. ئەوەی بۆ ئایدیۆلۆژیاش لەم نەخشەکردنەدا مابۆوە تەنها رەنگکردنی هێڵەکان بوو. بێتوانینی دەستکاریکردنی ئەم نەخشەیەو ئاراستەو پێکەیگەیشتنی هێڵەکانی. هەر ئەمەش خواستنی ئایدیۆلۆژیای بەو دیوەدا شکاندەوە کە میکانیزمێکی بەرگریکردن لە کولتوور بێت. کولتوور وەك ((سستمی ئاسایشی نەتەوە))[12]. و وەك مەرجەعێك و تاکە مەرجەعی خودرەسەنیکردنەوە و خودشوناسیکردنەوەی نەتەوە. لەمەوە، لەم ئامانجانەی پشتەوەی خواستن و تەوزیفکردنی ئایدیۆلۆژیاوە، پرۆسسی تەقدیسکردنەوەو میسۆلۆژیکردنەوەی کولتوور بەردەوامیدایە خۆی. بەلأم ئەمجارەیان جگە لە کولتوور و مەعریفەی کولتووری، ئایدیۆلۆژیاش لەم پرۆسسەدا بەشدارکرا. هەر بۆیەش ناسیۆنالیزم وەك سازترین ئایدیۆلۆژیایەك بۆ ئەم روانین و وێناکردنە بۆ کولتوور، زۆرترین رەواجی لەم کۆمەڵگەیانەدا هەبوو. ناسیونالیزم بۆ ئەم کۆمەڵگەیانە ئەو ((عصا))

ئەفسوونیە بوو، کە گرفت و ئیشکالیاتەکانی دوانەیی (( سەردەمیبوون – رەسەنیبوون)) و (( مۆدێرنەبوون – کولتووریبوون)) و ((ئایدیۆلۆژیبوون – ئاینیبوون)ی دەرەواندەوە !!. بەواتایەکیتر، نەك هەرجەمسەرەکانی ئەم ((دوانەیی))انەی لەبەردەم یەکتریدا رانەدەگرت، بەڵکو ئەندیشەی خولقێنەری دۆخێکیش بوو کە ئەم جەمسەرانە بێهیچ گرفتێك لەبەرامبەر یەکتری و بێهیچ پرسیارێك لە یەکتری بتوانن پێکدی بێنەوەو پێکەوەهەڵبکەن !!. هەر بۆیەش لە بزووتنەوە رزگاریبە نیشتمانیەکاندا و دواتریش لە رژێمەکانی (( سەربەخۆیی سیاسی))دا پیاوە کولتووری ئاینیەکان نەك هەردەیانتوانی هاوشان و هاورێو هاوکاری پیاوە ئایدیۆلۆژیەکان بن لە رابەرایەتی و کارگێری و رێکخستنەوەی کۆمەڵگە. بەڵکو زۆرجاریش لە کەسێکی سەرکردەو کاریزمادا ئەم دوانەییە ((ئایدیۆلۆژیبوون و ئاینیبوون)) بەرۆشنی بەرجەستەدە بوو.

کاتێکیش لە کۆتاییەکانی حەفتاکانی ئەم سەدەیەوە، پیاوانی ئایدیۆلۆژیاو پیاوانی ئاینی بەرەو لێکترازان و لێکلووركەوتنەوە دەچوون، بنەچەی ئەم ترازانەیان لەوێوە نەبوو کە پیاوانی ئایدیۆلۆژیا ((بەعەلمانی)) و پیاوانی ئاینی (( بەکولتووری)) بووبنەوە. بەڵکو لەوەوە بوو کە هەریەکەیان بێبەشداریکردن و هاوبەشیکردنی ئەویتر هەوڵی مۆنۆپۆلیزەیکردنی سەرمایەی رەمزی کۆمەڵگەی ئەدا. ئەمەش، ئەم ترازانەش دیسانەوە بەختێکیترو دەرفەتێکیتری بۆ کولتوور فەراهەمکرد تا جارێکیتریش بە دەورانی تەقلیدیکردنەوە و میسۆلۆژیکردنەوە وئایدیۆلۆژیبوونەوەدا گوزەر بکات . بەکورتی و لەم کۆمەڵگەیانەدا بە درێژایی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی و دواتریش لە تافی ئایدیۆلۆژیادا، سەردەمی رزگاریخوازی و سەربەخۆیی سیاسی . بەهۆی بەردەوامیی ئەندێشەی حەماسیانەی کۆمەڵگە بە هەردوو دیووی ئاینی و ئایدیۆلۆژیانەیدا کولتوور نەك هەر رووبەرووی پرۆژەیەکی رەخنەیی/ نەقلانیی نەبوەوە و پرسیاری جەوهەریی ئەوەی لێنەکرا کە لە

بەمیسـۆلۆژیکردنی مەعریفیانـــەی بکـــەوێت. بـــەڵکو تەقلیسـکردنەکانی بەرادمیـەك هەڵکشـاکە هـەموو ڕەگـەزە سوسـیۆلۆژی و مێژووییەکانیشـی لێتـەکێندرا. ولەمـەش واوەتـر هـەموو مێـژووی رابـردوو، و شارسـتانیتی رابردووی کۆمەڵگەی بە میسۆلۆژیکراوی تیناخنرا. وکۆمەڵگە لە بەرامبەر پێشینەو رابردوویـەکیدا ڕاگـیرا کـە سـەرتاپای میسـۆلۆژی و ڕەمزییـە و بازنەیەکە کە بە چەمکی ئارکۆن ((بازنەی قەدەغەیی بیرلێکردنەوە))یە.

* * *

دەکرێت ئەم پێشەکیە سەرەتای بەرچاوروونیەك بێت بۆ تێگەیشتن لە بنەچەی ئەندێشەکردنە ئێستەییەکانی ئەم کۆمەڵگەیانە، لـە تێروانینی میسـۆلۆژیانەو ئایدیۆلۆژیانـەیان بـۆ پرسـە هەنووکەییـە بنچینەییـەکانی کۆمەڵگە لە خۆشوناسیکردنەوە و ڕەسەنیبوونەوەو سـەردەمیبوونەوە، و لـە ئامادەکردنەوەی کولتوور، و ئەزموونکردنەوەو ئەوزیفکردنی کولتـوور وەك میتۆدێك، میتۆدێکـی مـەعریفی ئیشـکردنی مێژوویـی. ئیشـکردنێك کـە هەمیشە وەرچەرخاندنی ئەندێشە کردنەکانە بەرەو هەوڵی سەرلە نـوێ بەمێژوویکردنـەوە و بەکۆمەڵایـەتی و بەکۆمەڵگەییکردنـەوەی کولتـوورە: ئامادەیی کۆمەڵگە لە کولتووردا، و ئامادە کردنـەوەی کلتوور لـە کۆمەڵگەدا ا. یـان بەواتایـەکیتر، بـە کولتووریکردنـەوەی کۆمەڵگـە ا. لـێرەوە و بـەم ئەندێشـانەوە ولـەم کۆمەڵگەیانـەدا تـێروانین لـە کولتـــوور تەنـــها ئامادەکردنەوەی رابردوو نیـە !. تەنـها سستمێك نیـە لـە مۆراڵ وویـژدان و پابـــەندی و ئەندێشـــە ڕۆحیـــەکان کـــە ئاوێنەبوونـــەوەو بەرجەستەبوونەوەیەکی بەردەوامی لە بیرورەفتاری کۆمەڵایەتیانەدا هەیـە. بـەڵکو روئیایەکیشە بـۆ خوێندنـەوەی پرسـیارەکان. خوێندنـەوەی هـەموو گرفت و دەرگیریەکانی کۆمەڵگـە و هـەموو دیـاردە نوێکـان و نوێناکـاری و نوێخوازییـــە کۆمەڵگـــەیی و جیهانیـــەکان . لـــەمیش واوەتـــر بـــە

ئەیدیۆلۆژیکردنی ئەم روئیایەشە بۆ بەرێخستنەوەی دەورانێکی نوێ لە بە سیاسیکردنەوەی کۆمەڵگە : تێروانینێکی سیاسی/ ئایدیۆلۆژیانە لە دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن – لۆکالیزەیشن))، لە پەیوەندی و بەریەککەوتنەکانی ئەم دوانە. و وێناکردنی ئەم دوانەیەو پەیوەندیەکانی نێوانیان بە دوانەیی (( کولۆنیالیزم – کۆلۆنی))، دوانەیی (( هێرش – بەرەنگاری)) !!، تێروانینێکی سیاسی / ئایدیۆلۆژیانە لە فۆرمە جیاوازەکان، لە پێشداوەریە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانی تێگەیشتن لە سەردەمێتی و خوێندنەوەی دوانەیی (( سەردەمیبوون – رەسەنیبوون)).
کە ئەمەش لە سادەترین و رۆشنترین واتایدا، بە سیاسیکردنەوەی بەرژەوەندییەکی تایبەتیی کۆمەڵایەتی و بەرێخستنی ململانێیەکی کۆمەڵایەتی و تێکۆشانە بۆ بە دەسەڵاتگەیشتنێکی سیاسیانە. هەر ئەم بەئایدیۆلۆژیکردنەوەیەی روئیای کولتوورییە بۆخۆی، دەستپێکردنەوەی دەورانێکی نوێیە لە راگرتنەوەی کۆمەڵگە لە دۆخێکی شەڕ و ململانێی بەردەوام چ لەناو خۆیداو چ بۆ دەرەوەی خۆی. دەورانێکی نوێ بۆ سەرلەنوێ ئەزموونکردنەوەی ئایدیۆلۆژیاو مێژوونووسینەوەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیانە.
پرسیارەکانی پای ئەم تێروانینە کولتوورییەش دەکرێت وەها بێت کە: ئایا هەربەڕاستی و لەبنەچەدا پەیوەندی نێوان گلۆبالیزەیشن ولۆکالیزەیشن پەیوەندییەکی سیاسیانەیە ؟!. و دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن – لۆکالیزەیشن))، (( سەردەمیبوون – رەسەنیبوون))، و فۆرمەکانی تێگەیشتن لەم دوانەیانە سیاسی / ئایدیۆلۆژیانەیە ؟. ئایە بۆ خوێندنەوەی دۆخە کۆمەڵگەییەکان پاڵنەوەی مەعریفیانە ئایدیۆلۆژیانەیە؟! هەر لەمبارەوە، ئایا لەودیووی ئایدیۆلۆژیاو لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیا هیچ میتودێکیتری مەعریفی نیە بۆ ئەم خوێندنەوەیە. کەنەك هەر دۆخە سیاسیەکان بەڵکو تێزو میتۆدە ئایدیۆلۆژیاکان و گشتیی کۆمەڵگەیەکیش بخوێنێتەوە ؟. و دوا جار ئایا بەم تێروانین و ئیشکردنە

مەعریفیە ئایدیۆلۆژیە ئیشکالیەتەکانی پرسی دوانەیی (( گلۆبالیزەیشن ـ لۆکالیزەیشن )) قوڵترو فەیراناویتر نابن ؟. ئاکامەکانی بەودیوەدا نابێت کە ((سەر دەمیبوون )) و (( ڕەسەنیبوون )) لێکبترازێن ؟. دواپرسیار ، ئایا ئیتر لەم سەردەمەدا، سەردەمی گلۆبالیزەیشن ، خودڕەسەنیکردنەوە زەرووره و مانایەك و مەردودیکی دەبێت ؟ گەر ئا ،خودڕەسەنیکردنەوە پێناوی چی و لە بەرامبەر چیدا ؟. ئایا ئیتر کولتوور دەتوانێت بەشداریەکی هەبێت بۆ پرسی (( سەردەمیبوون )) ، دەتوانێت مانایەك بداتە سەردەمێتی ؟. ئەم پرسیارە بۆ ساغبوونەوەی سێ جۆر وەڵامی لە ئێستەی کۆمەڵگە وەرگرتۆتەوە :

١. ڕەتکردنەوەی تەواوەتی کولتوور و قبوولکردنی گشتیی فکری خۆرئاوا

٢. ڕەتکردنەوەی تەواوەتی فکری خۆرئاواو قبولکردنی گشتیی کولتوور

٣. قبولکردنی بەشێك ، چەند ڕەگەزێك لە کولتوور و لە فکری خۆرئاواو ڕەتکردنەوەی ئەویتری .

دیارە جیابی ئەم وەڵامانەش لە جیای ئەو تەرحە ئیدیولوژی و مەعریفیانەوەیە کە کولتوور و فکری خۆرئاوای پێدەخوێندرێتەوە و پێوێنادەکرێت . بەرلەباسکردن و ووردکردنەوەی ئەم جیابانەش دەبێت ئەوە بڵێین کە ئێستا لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا دوو مۆدیل لە وێناکردن، لە خوێندنەوەی (( کولتوور)). (( سەردەمێتی)) هەیە. ولەمیشەوە دوو مۆدیل لە ئیشکردن لەسەر ((کولتوور)) و لەسەر (( سەردەمێتی)) هەیە.

ا- بۆ کولتوور: مۆدیلی وێناکردن و ئیشلەسەرکردن و خوێندنەوەی "کولتووریانەی کولتوور"، ومۆدێلی وێناکردن و ئیشلەسەر کردن وخوێندنەوەی "سەردەمیانەی کولتوور". بەواتایەك مۆدیلی ((بەکولتووریکردنی کولتوور)) و مۆدیلی ((بەسەردەمیکردنی کولتوور)).

ب- بـــۆ ســـەردەمێتی: مۆدێلـــی وێنـــاکردن و ئیشلەســـەرکردن و خوێنـــدەوەی "کولتووریانـــەی ســـەردەمێتی" ، مۆدێلـی وێنـاکردن و ئیشلەســـەرکردن و خوێنـدنـــەوەی "ســـەردەمیانەی ســـەردەمێتی".
بەوتایەك مۆدێلی ((بـە کولتوریکردنـی سـەردەمێتی )) ومۆدێلـی ((بەسەردەمیکردنی سەردەمێتی )).

ئەگـەر ئـەم دوو مۆدێلیبوونـە بـۆ خـودی کولتـوور بنەچـەو حەقیقـەتی ترازانێکـی دوانـەیی ((میسـۆلۆژی ـ مـەعریفی )) دوانـەیی ((سۆسیۆلۆژی/ مێژوویی ــ ئایدیۆلۆژی )) کولتـوور بێـت ، بەوتایەکیتر، جیابوونـــەوەو جیاکردنـــەوەی ڕەگـــەز و لایەنـــە (( میســـۆلۆژی ، ئایدیۆلۆژی))یەکانی کولتـوور بێـت لـە ڕەگـەز و لایەنـە (( سۆسـیۆلۆژی ، مێژوویی و مـەعریفی )) یـەکانی کولتـوور . ئـەوا لـە ئاستی کۆمەلآیەتی و مەعریفیانـە ، و بـە هـۆی دوو مۆدێلیبوونیکـی (( بەسـەر دەمیکردنـی سەردەمێتی))، ترازانی کۆمەلگە دەبێت بۆ سێ ئینتمای کۆمەلآیەتی ، سێ بازنە و فەزای مەعریفی جیاواز و پێك ناکۆك . سێ تیژی نەنێشەکردنی مێژوونوسینەوە . سێ فۆرمـی تێگەیشـتن لـە دوانـەیی((گلۆبالیزەیشـن ـ لۆکالیزەیشـن )) و دوانـەیی ((سـەردەمیبوون- ڕەسـەنیبوون)) یەکـەم تێڕامانیش لەو سێ جۆر وەلآمەرگرتنەوەیەی پرسیارەکەی پێشو وەهایە :

- ئەگـەر ئـەم وەلآمانـە هەرسـێکیان لەسـەر ئـەوە کۆکـبن کـەبۆ ((خودڕەسەنیکردنەوە))جگە لە کولتوور هیچ پالنەوەیەکیتر نیـە . وەلێ لـە وێوە لێکجیا دەبنـەوە و بەرامبـەر دەبـن کە هەریەکەیان جۆرێـك هەلوێسـت لـە بەرامبـەر کولتـوور وەردەگرێـت . جۆرێـك کولتـوور وێنادەکـات و دەخوێنێتـەوە . وبەگشـتی لەمەشـدا دوو مودێلیبوونێـك هەیـە ، ئـەم مۆدێلـە لای دوو وەلآمەرگرتنـەوەی یەکـەم و دووەم خوێندنـەوەی ((کولتووریانـەی کولتـوور )) و وێنـاکردنی (( میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیانـە))ی کولتـوورە . ئەمـە لەگەل جیای هەلویستی هـەر کامەیانـە لـە کولتـوور . بـەلآم لای

وەلامورگرتنەوەی سێیەم ئەم مۆدێلە خوێندنەوەی ((سەردەمیانەی کولتوور )) و ((بە سۆسیۆلۆژی/مێژوویی /مەعریفی ))کردنی کولتووره . دەرکێشانێتی لەژێر ئەفسوونی میسۆلۆژیاو ئایدیۆلۆژیا.

* ئەگەر دوو وەلامورگرتنەوەی یەکەم و سێیەم بەوە لە وەلامورگرتنەوەی دووەم جیابنەوە کە خوێندنەوەیان بۆ پرسی (( سەردەمێتی )) کولتووریانە نیە و سەردەمیانەیە . وەلێ لە وێناکردنیان بۆ پرسی ((سەردەمێتی)) لێکجیا دەبنەوە . و لەمەوە ئەگەر وەلامورگرتنەوەی یەکەم وەها لە ((سەردەمێتی)) دەروانێ کە هەر دەبێت سەردەمیبوونێکی گلوبالیزمیشنانە بێت ا، بە ئەندێشەی دارشتنەوەی گلۆبالیزمیانەی کۆمەلگە ا، وراگرتنی کۆمەلگە لە پنتێکدا کە پشتەوەی نیە ا. بەواتای تەکاندنی کۆمەلگە لە هەموو یادەوەری و رابردووەکانی.[42] ئەوا وەلامورگرتنەوەی سێیەم تێروانینی بۆ پرسی ((سەردەمیبوون )) وەهایە کە هەر دەبێت لە حەقیقەت و خۆ راگیرکردنەوەی ئێستەیی لۆکالیزمیشنی کۆمەلگەوە بێت . دارشتنەوەیەك بێت کە کۆمەلگە دەربازی دۆخی لۆکالیزمیبوون و گەیشتن بە دۆخێك بێت کە بەرامبەر وەستان و واتاداری ((گلۆبالیزمیشن۔ لۆکالیزمیشن))ی نەبێتا.

لێرەوە و بەم ئاماژانە لە کۆکبوونە رۆالەتیەکانی ئەم سێ وەلامورگرتنەوەیە ، دەگەینەوە ئەو تەنکیدەی کە ئەم سێ وەلامورگرتنەوەیە جگە لە ئاوێنە کردنەوەی حەقیقەتی ئەوترازانە سێیە کۆمەلاتی و مەعریفیەی پێشتر باسمان کرد شتێکیتر نیە . لێرەدا بەدواخستنی باسکردنی وەلامورگرتنەوەی سێیەم بۆ دواتری ئەم بەشە ، دەلێم :

ئەوەی ئێستا لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا باوەو وەك رونیا پێداگیری لێدەکرێ . دابڕکردن و ترازانلنی (( سەردەمێتی )) و ((ڕەسەنێتی ))یە لەیەکتری . بەرجەستەکردنەوەی یەکێکیانە بێنەویتر : یان سەردەمیبوون ! یان ڕەسەنیبوون!. کە ئەمەش حەقیقەتی دوو وەلآموەرگرتنەوەی یەکەم و دووەم ، و پێشداوەرییە مەعریفیەکانی ئەم دوانەیە .لەمەوە و ئەگەر وەلآموەرگرتنەوەی یەکەم بە هۆی ئەو جێکەوتنەی تا ئێستای کولتوور لە یادەوەریمان و لە رۆشنبیریماندا، و ئەو وێنا کردنەی کۆمەڵگە بۆ کولتوور، وەك چوارچێوەو رابردوویەکی میسۆلۆژی . پراکتیزەبوون و ئەزموونکردنەوەی کولتوور لە ئیستای کۆمەڵگەدا بە مەحاڵدەزانێت . و بەهۆی تێڕوانینی گلۆبالیانەی بۆ ئێستە . ئێستەی جیهان و کۆمەڵگە ، و خۆبەدەستەوەدنەکانی بە فەرمان و ئەندێشەکانی گلۆبالیزەیشن . ئەگەر بە هۆی ئەمانەوە هەر هەوڵ و ئەندێشەیەکی کۆمەڵگە بۆ خۆڕەسەنیکردنەوە بە بیمانـاو بیناگام بزانێت . و پێداگیری و ئەندێشەی ڕەسەنیبوونێك بکات کە خود کۆمەڵگەیی نیە . و سەردەمیبوونێکی گلۆبالیزەیشنە ! . ئەوا وەلآموەرگرتنەوەی دووەم بە هۆی تێڕوانینە سیاسی/ ئایدیۆلۆژیەکانی لە دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن -لۆکالیزەیشن)) و دوانەیی ((سەردەمیبوون، ڕەسەنیبوون )) ! . و بەهۆی وێناکردن و ئەندێشەکانی بۆ گلۆبالیزەیشن وەك فۆرمێکیتری کۆلۆنیالزمی وتێزێکیتری هێرش وداگیرکاری !. وتێگەیشتنی لە (( ڕەسەنێتی)) و ((سەردەمێتی)) وەك دوو چەمك و دوو حەقیقەتی مەعریفی و کۆمەڵگەییانەی بەرەنگاریانە !. و دواجاریش خوێندنەوەی کولتووریانەی ئەم دووچەمکە. ئەگەر بەهۆی ئەمانەوە پێداگیری لە ((ڕەسەنیبوون)) ئێك دەکات کە کولتووریانەیە. ولەمەشەوە کۆمەڵگە بانگهێشتی ئەوە دەکات وبەرەو ئەوە راپێچیدەکات کە (( سەردەمێتی))یەکی رابردوویی ئەزموونبکاتەوە. بەواتایەك ئەگەر یەکەمیان پێداگیری و ئەندێشەیەکە بۆ

سەردەمیبوونێکی بێڕەسەنێتی).ئەوا دووەمیان بانگەشەیە بۆ ڕەسەنیبوونێکی بێسەردەمێتی).

دیسانەوە ئەگەر لە یەکەمیاندا بۆ خۆرئاواییبوون، گلۆبالیزمیبوون، وەهمی قۆناغسووتاندن هەیە. ئەوا لە دووەمیاندا، رابردوویبوونەوە وکولتووریبوونەوە. جگە لە وەهمێکی مێژووسووتاندن شتێکیتر نیە. لەیەکەمیاندا مێژوویەك دەسووتێنرێ کە مێژووی کۆمەڵگەیەکیترە، و لە دووەمیاندا ئەوەی لای لێناکرێتەوە و بەدۆڕاندن ئەچێت ئێستەیی کۆمەڵگەیە، ئێستەییەك کە بۆ خۆی دۆخێکی تایبەتی و بازنەیەکی تایبەتمەندە، جیا لە بازنەی کولتوور و فکری خۆرئاوا لە رووی گرنگیپێدان، میتۆد، روئیا. هەڵوێست(( کایەی مەعریفی و بازنەی مەعریفی)) [٤٤] ئەمە، ئەم دوو وەڵامە تێپەڕینی ئەم ئێستەییەی کۆمەڵگەن بەرەو دوو جیهان، دوو شارستانیەت، کە لە نێوان ئێستەی کۆمەڵگەو ئەواندا، دابڕان هەیە . ئەگەر لە یەکەمیاندا ئەم دابڕانە (( مەعریفی / کۆمەڵگەییە ))؛ بۆ تەبەنناکردنی پێدراوەکانی شارستانیەتێك کە شارستانیەتی کۆمەڵگەکانی ئێمە نیە و کۆمەڵگەکانی ئێمە بە سەرەتاکانی بەرێکەوتنی ئەم شارستانیەتەو گەشەسەندنەکانی نامۆیە . و هاوڕێیەتی پرسیارو گوومانەکانی ئەم شارستانیەتەو چۆنایەتیەکانی ڕەواندنەوەی ئەم پرسیارو گوومانانە نەبووە. بە واتایەك ئەم شارستانیەتە بەرهەمی ئیشکردنی کۆمەڵگەیترە لەسەرخۆی. ئەوا لە دووەمیاندا، ئەم دابڕانە ((مێژوویی / کۆمەڵگەییە)). ڕاپێچکردنەوەی کۆمەڵگەیە بەرەو شارستانیەتێکی خود کۆمەڵگەیی بەڵام رابردوویی. بەرەو شارستانیەتێك (( کە لەمێژە لەگەشە و داهێنان و نوێبوونەوە وەستاوە)) [٤٥] وجگە لە رابردوویەك ڕابردوویەکی دوور شتێکیتر نیە .

ئەمە، ئەم دوو تێزی وەڵاموەرگرتنەوەیەی کۆمەڵگە، ئەم دوو مۆدیلە لە ئیشکالیەتی ((سەردەمیبوون – ڕەسەنیبوون))، لە ترازانی ئەم دوانە لە یەکتری ، ونەتوانینی دۆزینەوە وپەیبردن بەو ((چۆنایەتی))یەی

که پێکەوە هەڵکردن و پێکەوە هاوشانیبوون و پێکەوە بەرجەستەبوونی کۆمەڵگەیی و مێژوویی و مەعریفیانەی ئەم دوانە دەستەبەرو فەراهەمدەکات، ئەم وەهمە لە ئەندێشەکردنی ئامادەیی کۆمەڵگە بۆ خۆ دارشتنەوەیەك لە پێدراوەکانی شارستانیەت و سەردەمێکەوە کە بە ئێستەی کۆمەڵگە نامۆیە، یان کۆمەڵگە لە ئێستەدا پێی نامۆیە. بۆ مێژوو نووسینەوەیەك کە هیچ پاڵنەوەیەکی کۆمەڵگەیی ومەعریفی لە ئێستەی کۆمەڵگەدا نیە، بەکورتی ئەم وەهمە لە ناچارکردنی کۆمەڵگە بە دۆڕاندنی ئێستەییەکانی و لەمیشەوە دۆڕاندنی گرەوە مێژووییە ناینەدییەکانی. ئەڵێم ئەمە بەرئەنجامی ئەو (( هوشیاریە ئاوەژوو)) [١٦]ە یە کە ئێستەی رۆشنبیری کۆمەڵگەکانی ئێمەی پێتایبەتمەندە.

لێرەوە و بەخۆڕاگیرکردن - باس ڕاگیرکردن - لەسەر یەکێك لەم دوو تێزی وەڵامە لەسەر تێزی (( بەکولتووریکردنەوە)) باس لەدیوێکیتری ئاوێنەکردنەوە وبەرجەستەکردنەوەی ئەم ((هوشیاریە ئاوەژوو))ە دەکەین، کە ئەویش دیلکردنی کۆمەڵگەیە لە دوو مۆدیلی (( ئیشکردنی مێژوویی)) کە هیچ پاڵنەوەیەکی مەعریفیانەی لە ئێستای تێیەرینی تافی ئایدیۆلۆژیادا نیە.

ئەگەر تێزی یەکەمی ئەم وەڵامە - گلۆبالیزمیبوون -، ئەندێشەیەك بێت کە تا ئێستا لەناو دەستەبژێرێك لەرۆشنبیران پێگەیەکی هەبێت ونەیتوانیبێ وەك میتۆدێك، میتۆدێکی ((ئیشکردنی مێژوویی))، سستماتیزمیی وکاریی بداتە خۆی. ئەوا تێزی دووەم - کولتووریبوونەوە، یان بە کولتووریکردنەوە - وەهانیە. ئەمیان بەهۆی خۆڕاگیرکردنی توندی لەسەریادەوەری و ئەندێشە میسۆلۆژیەکانی، وبەهۆی مۆنۆپۆلیزەکردنی سەرمایەی رەمزی کۆمەڵگە، پێگەیەکی بەهێزی کۆمەڵایەتی و ((سوپاگریەکی جەماوەر))[١٧]ی توکمەی هەیە. و وەك میتۆدێکی مەعریفی لە ئیشکردنی ئەکتیڤانەدایە لەسەر کۆمەڵگە و لەسەر مێژوو. بەلام تەنها وتاقانە نیە لە ئیشکردن. بەڵکو میتۆدێك و مۆدیلێکیتری

نیشکردنیش هەیە کە (( نایدیۆلۆژیانەیە )). و ئەندێشەکانی (( بە نایدیۆلۆژیکردنەوەی سەرلەنوێی کۆمەڵگە ))یە. و وەك پاشماوەیەکی تافی نایدیۆلۆژیا. و ناوێنە کردنەوە و لاسایکردنەوەیەکی خونشوناسیکردنەوە و خودرەسەنیکردنەوەی کۆمەڵگە لۆکالیزەییە پلە ((یەك))ەکان، ((بەکولتووریکردنی نایدیۆلۆژیا))، درێژە بەخۆی نەدات. بەرامبەروەستانی نێوان ئەم دوو میتۆدە ئەم دوو مودێلە لە رووی نایدیۆلۆژی و کومەلایەتی وسیاسیەوە. لەوێوە نیە کە یەکێکیان لەسەر هەق بێت و ئەویتر نەء! .
چونکە هەردووکیان پاشماوەی رابردوون. هەردووکیان رونیاکانیان ئێستەیی نیە. ئەگەر رونیای نایدیۆلۆژیانە لە دوێنێی نزیکدایە ئەوا رونیای کولتووریانە لە دوێنێی دوور ، زۆر دووردایە. لەمەشەوە نیشکردنەکانی هەردووکیان بەرەو داکشانی کۆمەڵگەن نەك هەڵکشان.

بەرامبەر وەستانی نێوان ئەم دوانە دەکرێت بە دروستی لە وێوە قسەی لەسەر بکرێ ، کە هیچ کامیان خۆ لەسەر (( گەمەی فاکتەرەکان ))[48] ، فەزای جیاوازییەکان راگیرناکەن، و باوەڕیان بە ((فاکتەری یەکلاییکەرەوە - حاسم))[49] هەیە. کە ئەمەش بۆ خۆی داگیرکردنی گشتیئەو میتۆدەیە لە لایەن ((یەقین))ێکەوە کە ئەم میتۆدە لەوە ئەتەکێنێ (( میتۆدێك بێت بۆ پراکتیزەکردن)[50] کاتێکیش ئەم ((فاکتەری یەکلاییکەرەوە))یە لەهەر کامەیاندا جیاواز دەبێت، ئەوا بەرامبەر وەستانەکانیان (( یەقینیی / عەقیدەیی)) دەبێت.

لەهەریەك لەم دوو میتۆدەدا، لای هەرکامەیان: یەقینێکی سێنتەری هەیە، کە هەموو یەقینە پەراوێز "هامش"ەکانی لەسەر رادەگیرێ، موتڵەقێکی سێنتەری هەیە کە دەبێت بدۆزرێتەوە و بەرجەستە وپراکتیزە بکرێتەوە، کە هەموو موتڵەقە پەراوێز "هامش"ەکانی پێدەدۆزرێتەوە ! . هەربۆیەش ئەم دوو مۆدێلی نیشکردنە نەك هەر بۆ راڤەکردنی واقیع و خوێندنەوەی واقیع نابێت و، ئەمەی پێناکرێت و

نایەوێت بیكات. بەڵكو بۆ بلۆككردنی واقیعە لە ڕوونیایەكدا كە پراكتیزەكراوو ئیدیاڵە.

لێرەوە دەكرێت باس لە : سێ مۆدێلی ئیشكالیەتی دوانەیی ((سەردەمیبوون – ڕەسەنیبوون))، سێ فۆرمی تێگەیشتن و خوێندنەوە، سێ تێزی ئێستەیی دۆڕاندن، سێ تێزی دوڕاندنی گرەوی مێژوویی ئایندەیی، سێ ئەندێشەی دارشتنەوەی كۆمەڵگەیی نا ئێستەیی، سێ ئەندێشەی مێژوونووسینەوەی نائێستەیی، دواجار سێ تێزی ناوێنەكردنەوە و بەرجەستەكردنەوەی هوشیاری ناوەژوو بكەین. كە ئەوانیش ئەمانەن:

- گلۆبالیزەییبوون.
- كلتووریبوونەوە، یان بە كلتووریكردن.
- ئایدیۆلۆژیبوونەوە، یان بە ئایدیۆلۆژیكردن.

خەسڵەتی (( هوشیاریە ناوەژوو))ە كانیش وەهایە: كە بەهۆی چەقگرتوویی بازنەییانەی خۆ بەرهێنانەوەی هەمیشە (( وونبوون)) و ((نامۆییبوون))ێك دەكاتە قەدەری كۆمەڵگە، وهەموو پرۆژە و گوتارێكی ئەم هوشیاریە و ڕاوەستاو لەسەر ئەم هوشیاریە، یەم یان یەو دیوەدا یۆتۆپی، نا مێژوویی، میسۆلۆژی دەبن، لەوێشەوە كە پراكتیزەكردنی كۆمەڵگەیی و مێژووییانەی پرۆژەسازیەكانی ئەم هوشیاریە مەحاڵدەبێت . هەمیشە هەوڵەكانی ئەم پراكتیزەكردنە حاڵەتێك لە ((ئائارامی)) و ((ناسەقامگیری)) و (( ئەنارشیزمی)) دەخوڵقێنێ. و تەوزیفبوونەكانی بە چەندەها ((شێوازی ناشارستانی)) و (( دەستەپێتیەكی شارستانیانە كە كۆفاكتەری هەموو ئسوولگەرییە عەقیدەییەكانە ))[51] و بە ((زەنیەتێكی زەبروزەنگ ئامێزەوە))[52] و بە ((كردەكانی زەبروزەنگ و پەرچەكردەی زەبروزەنگ ))[53] . بە ((تیرۆر، زۆربۆهێنانی سیاسی، ئیستبدادی سیاسی))[54] گوزارشت لە خۆیدەكات ، و ڕێ بۆخۆیدەكاتەوە. و دەبێتە مایەی ((ئیمەنێكی مەترسیدار لە ئەناشیزمی مەعنەوی ، و مومارەسەی

زۆری بە میسۆلۆژیکردن و بە ئایدیۆلۆژیکردن . و ڕاپەڕینی کۆمەڵە ئەتنیی و ڕۆشنبیریەکان ))[55] . وێڕای ئەمەش و لەوێشەوە کە ئەم پرۆژەسازیانە لە (( مێژوو دەرچونن ))[56] هەمیشە بنەچەو بناغەیەکن بۆ دامەزراندنەوەی ((سستمە سیاسیە تۆتالیتاریزمی ))یەکان . و بەوەش کە (( هەڵگەڕانەوە لە مێژوون ))[57] و پاڵنانەوەکانیان لە ئێستەدا نیە و لەگەڵ کەش و ڕێساکانی سەردەم نایەنەوەو ((بە زەرووەرەت تاوانی گەورەی کۆمەڵایەتیان لێدەکەوێتەوە ))[58] . دواجاریش و بەتێڕوانینی "دکتۆر محەمەد بەغدادی" دەبێت بووترێت کەهەموو ((پەستاندنێکی ئێستەو ئایندە لە تونێلەکانی رابووردوو کە مەحاڵگەلێکی ڕۆشنە ......... زەبرو زەنگ و توندڕەوی ))[59] دەکاتە میکانیزمی ئەم مەحاڵبوونە .

**بازنەی هوشیاری ئاوەژوو :**

(( هوشیاری ئاوەژوو ← ونبوون / نامۆییبوون ← هوشیاری ئاوەژوو))

یان

(( هوشیاری ئاوەژوو ⇄ ونبون / نامۆییبون ))

واتە : هوشیاری ئاوەژوو خۆی خۆی بەرهەمدێنێتەوە! .

هوشیاری ئاوەژووی تافی ئایدیۆلۆژیا .

ئیشکالیەتی دوانەیی (( ڕەسەنێتی - سەردەمێتی ))

{ بە هۆی ئەندێشەکردنە وەهمیەکانی :

پێکەوەهەڵکردن"، عەلمانیەت و ئاین" ! ، "میسۆلۆژیا و مۆدێرنە" !، ئیمکانی "مۆدێرنەبوون بەبێ مۆدێرنیتە"! ، "پیشەسازیبوون بەبێ ئەقلانیەت" ! ، "ئایدیۆلۆژیبوون بەبێ عەلمانیەت" !. دواجاریش و لەکۆگیری ئەمانەوە ئیمکانی هەڵواسینی میدالیای "عەلمانیەت، دیموکراسی"

لەسەر پۆشاکێکی کولتووری "ڕەقەمن ، نەخوێندراوە ، میسۆلۆژی" !! ، و ئیمکانی پێکەوە سازانی سەردەمێتی "ئایدیۆلۆژیانە" و ڕەسەنێتی "کولتووریانە"، دوا پرۆسسیش "خۆماڵیکردنی کولتووریانەی ئایدیۆلۆژیا". }

↓ ناکام و ناراستەکان

وونبوون + نامۆبیبوون

((وونبوون لە نێوان کولتوور و فکری خواستراو ))[١٠]

وونبوون لە فەزایەکدا ، سەردەرنەکردن و توانانینەبوونی خودشوناسیکردنەوە لە فەزایەکدا کە کەوتۆتە ژێرکاریگەریە ئەکتیڤ و کاراکانی میسۆلۆژیا و تەکنۆلۆژیا!.

نامۆبوون بەرامبەر : ئێستەیی کۆمەڵگە و کەشی سەردەم، بەرامبەر بنەچەی مەعریفیانەی فکری خۆرئاواو کولتوور ، بەرامبەر بنەچەی هەڵکشانی گلۆبالیزمی – تەکنۆلۆژیانەی خۆرئاوا، و داکشانی لۆکاڵیزمی – میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیانەی کۆمەڵگەی خود .

↓ لە میشەوە بەرهەمهاتنەوەی جارێکیتری

هۆشیاری ناوەژووی ئێستای ڕۆشنبیریمان

تێزەکانی ئیشکالیاتی دوانەیی (( سەردەمێتی – ڕەسەنێتی)) کە پرسێکە لای "ئارکۆن" ئیشکالیاتی ((ئەو ملیۆنەها موسڵمانەیە کە دەیانەوێت وەزع و شوێنی خۆیان لە جیهانی سەردەم بزانن و بدۆزنەوە . کە دووچاری جۆرەها ناکۆکیبوون و دەیانەوێت لەو ناکۆکیانە تێپەڕێنن))[١١] . لێرەوەو بەم ناوێتەبوونەوەیەی هۆشیاری ناوەژوو لەدۆخی

ئێستەی کۆمەڵگەدا دێنێتە سەرباس و راوەستانێك لەبارەی وەلاموەرگرتنەوەی سێیەم . کە لای "جابری" ئەو تەنها رێگەچارەیە کە دەتوانێت کۆمەڵگەو رۆشنبیری کۆمەڵگە لەو ئیشکالیاتانەی ئێستە دەرگیربووی تێپەرێنێ. تێپەرینی ئەم هۆشیاریە ناوەژووە بەرەو هۆشیاریەکی ئەقلانی و لە میشەوە رەوینەوەی هەموو ئیشکالیاتەکانی پای ئەم هۆشیاریە ناوەژووە، لای "جابری"، بەو پرسیارە مۆدێرنیتەیە دەستپێدەکان کە هەر بە ووتنی خۆی (( پرسیارێکی فرە رەهەندە. پرسیارێکە لە کولتوور دەکرێت بە هەموو کایەکانیەوە. و پرسیارێکە لە خودی مۆدێرنیتەش دەکرێت بە هەمووپێدرا و و ئامانجەکانیەوە. ئەمە پرسیاری ئەوەیەك، بگرە هەموو ئەوەکانە. پرسیارێکە پێبەهێنی نوێبوونەوەی ژیان نوێدەبێتەوە))[١٢] کە ئەمەش بۆخۆی هەم لەبەردەم خوێندنەوەیەکی نوێی کولتوورمان دادەنێت کە جیا لەو خوێندنەوانە بێت کە ((ئۆرێنتاریزمی)) و بلندگەرایی ((کولتووریەن)). و هەم خوێندنەوەیەکی نوێی خۆرئاواشە کە جیا لە خوێندنەوەی خۆرئاوا بۆ خودی خۆی کە بلندگەراییە. و جیا لەو خوێندنەوانەی دەرەوەی خۆرئاواشە بۆ خۆرئاوا کە زۆرتر خوێندنەوەیەکی کولتووریی و ئاینیە . لای "جابری" ئێستەی کۆمەڵگەکانمان دۆخ و حاڵەت و فەزایەکە کە تایبەتمەندێتی خۆی هەیە. نە بۆئامادەکردنەوەو تەوزیفکردنی پراوپری کولتوور دەستئەدات ، نە بۆ تەوزیفکردنی پراوپری فکری خۆرئاوا . هەر بۆیە چەمکی ((سەربەخۆیی مێژوویی))[١٣] دێنێتە کایەی زەروورەتی خوێندنەوەو ئیحتواکردنی ئێستە . خوێندنەوەیەك کە بتوانێت ئاینده فەراهەم و ئاسۆ روونبکات . لای "جابری" ئەم چەمکە بەمانای خۆداخستن و خۆبریمیتیفکردن و خۆئیدیالکردنی کۆمەڵگە نیە، بەمانای سەربەخۆییبوونی مێژوویی نیە لەوانیتر. و "جابری" خۆی ئەمە روونئەکاتەوە بەوەی ، ((سەربەخۆیی )) بوون لێرەدا سەربەخۆبوونی تێروانین و تێگەیشتنە بە جیا لە دەرەوەی کاریگەریە مەعریفیەکانی

فکـری خۆرئـاوا و کولتـوور ، چەمکێکـە بـۆ ((ڕەخنـەگرتن لـە چەمکـە میراتبووەکـان و لـە چەمکـە خواسـتراوەکان ))[٦١] . میتـۆدی خـودی ئـەم ئیشکردن و پرۆژەسازیە ڕەخنەییە لای "جابری" خواستنی خـودی ئـەو میتۆد و ڕوئیایەیە کە خۆرئاوا بۆ خوێندنەوە و ڕەخنـەو ئیشلەسـەرکردنی ڕابردووی خۆی بەدەستیەوە گرتبوو ، نەك ئەنجامـەکانی ئـەم ئیشکردنەی. بەواتایـەکیتر، لەمیتۆدەوە دەستپێکردن نـەك لەئەنجامـەوە وەرگرتـن ، کـە ئێستا زۆر باوەو کاری لێلّ و بێئاراستەو تەنها ئاماژەو ووتـنی تیـادەکرێت بـەبێتوانینی بـە پراکتیککردنـی ئـەم ئامـاژە ووتنانـە. خواسـتن لـێرەدا بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئـەو پـرۆژە ڕەخنەسـازیە ئەقلانیەیـە کـە دەکرێـت مەعریفیانـە کولتـووری پـێ بخوێنینـەوە. خوێندنەوەیـەك کـە کولتـوور بێنێتـە پای مەعریفیەکی سوسیۆلۆژی و مێژوویانـەی وەهـا کـە توانـای شوناسـیکردنەوەی سـەردەمیانەی کۆمەڵگـەی هـەبێت . و لـەو تێڕوانینـە ڕابردووگەریـە مسیۆلۆژیەی تێپـەڕێت کـە تـا ئێسـتاش هەیـەتی، و بـە شـێوەیەکی یۆتۆپیانـە هـەوڵی بەرهەمهێنانـەوەی بـەردەوامی دەدرێـت . خوێندنەوەیەك کە داڕشتنەوەی نوێـی کولتـوور و ڕزگارکردنی بێـت لـەو هەموو پاشخانە ئایدیۆلۆژی و مۆڕاڵ و ویژدانیەی کە هەیەتی و پێیدراوە. خوێندنەوەیـەك کـە بـە واتایـەك ئامـادە کردنـەوەی کولتـوورە بـۆ تەوزیفکردنێکی مەعریفیانە .

لێرەوە بـۆ ڕوونکردنـەوەی مۆتیڤـە ناوەکییـەکانی کولتـوور و چۆنایـەتی تـەوزیفبوون و تەوزیفکردنـەکانی کولتـوور، و چۆنایـەتی ئامادەگی و ئامادەکردنەوەی کولتوور، و ئەو شێوازو تێزە باوەی تـا ئێستاو ئێستەی ئـەم تـەوزیفکردن و ئامادەکردنەوەیەی کولتوور لەناو کۆمەڵگەو لـەناو ڕۆشـنبیریماندا، پێمچاکـە گەڕانەوەیـەك. گـەرچی گەڕانەوەیـەکی ئاماژەگەریی و ڕاگوزەیشبووە بکەین بۆ دوو بیریـاری عـەرەبی کـە ئـەوانیش "جابری" و "ئارکۆن"ن. کـە لەبەشـەکانی پێشـتووتری ئـەم باسـەدا و بەتایبـەتیش لەباسی دووانـەیی ناوەکیانـەی کولتوور. پـەنام بـۆ بیروڕاکـانی

ئەم دوو بیریارە بردووە. و سەرەتای ئەم روونکردنەوەیەش وەها دەستپێدەکەم کە ئەگەر لای "جابری" دووجۆرە تەوزیفکردنی کولتوور هەیە : مەعریفیانەو ئایدیۆلۆژیانە. و بەهۆی لێکدانەوەی باوو بالأدەستی ناو رۆشنبیریمان کە وێناکردنێکی ئایدیولوژیانەی بۆ دوانەییەکانی سەردەمیبوون – رەسەنبیوون)) و ((گلۆبالیزەیشن – لۆکالیزەیشن)) و وێناکردنێکی بەرەنگاریانەی بۆ پرسی سەردەمیبوون هەیە. ئەوا ئەوەی زۆرتر لە تەوزیفکردنی کولتووردا زاڵە و باوە تەوزیفکردنە ئایدیۆلۆژیاکەیەتی، و هێشتا هەوڵ و هەنگاوی جدی نیە بۆ تەوزیفکردنی مەعریفیانەی کولتوور . ئەوا لای "ئارکون"یش کولتوور هەمان دوو جۆرە تەوزیفکردنی هەیە ، تەوزیفکردنێکی پۆزەتیفی و دینامیکی بۆ هەڵکشانی کۆمەڵگە بەرەو ئاینده، وتەوزیفکردنێکی نێگەتیفی و خۆپارێزی و قۆزاخەگەریانە بۆ داکشانی کولتوور ئائاستی ((عەقیده)). لای "ئارکون" کولتوور دوو جۆرە مەعریفەی لە خۆیدا هەڵگرتووە : مەعریفەیەکی مسیۆلۆژی - مەعریفەیەکی سۆسیۆلۆژی و مێژوویی . بەلأم ئەوەی لە ئێستەی کۆمەڵگەدا زاڵە تەوزیفبوونە (نێگەتیف/قۆزاخوگەری /مسیۆلۆژی)یەکەیەتی، و تا ئێستاش هەوڵی جدی ئەوە نیە کە تەوزیفکردنی کولتوور وەرچەرخێنە تێپەڕینی گوزارشتی رەمزیانەی کولتوور بەرەو گوزارشتێکی سۆسیۆلۆژی /مێژوویی .

هەر سەبارەت بە ئیشکالیاتی دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن – لۆکالیزەیشن))یش دێمە ئاماژە بەوەی کە ئەگەر خوێندنەوەی ئەم ئیشکالیاتە لای "جابری" ، ئیشکالیاتی دوانەیی ((سەردەمێتی – رەسەنێتی)) یە . و گوزارشتە لەو ((هوشیاریە ناوژوو))ە ی کە رۆشنبیری ئێستەی کۆمەڵگەکانی ئێمەی داگیرو کۆنترۆڵکردووە . و بنەچەی لۆکالیزەیبوونی کۆمەڵگە و داکشانی میسۆلۆژیانەیەتی. ئەوا ئەمە لای "ئارکۆن"، ئیشکالیاتی دوانەیی ((مۆدێرنە – مۆدێرنێتە)) یە کە بەرهەمهاتووی ئەو رۆشنبیریەمانە کە بە (( اسـتقالە ))ی

ئەپیستمۆلۆژی و خودشوناسیکردنەوەی میسولوژیانەی ((بێهیچ و ڕونیایەکی مێژوویی ))[15] پێناسەی ئەکات . لای "د.هاشم صالح" وەك ئەنجامگیریەکی لە تێڕوانینەکانی "ئارکۆن"، ئەمە بەنیشکالیاتی دوانەیی ((عەلمانیەت – کولتوور))دائەنێت کە بە هۆی ((فراغ)) ی ئەپستمۆلۆژی ناو ڕۆشنبیریمان، نەتوانراوە ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان ئەم دوانەدا بێتەئارا ((کەدوو فۆرمی جیاوازن لە ئیدراك ، هۆشیاری ، بیرکردنەوە ، پێشکەوتن و داهێنان و مەعریفە))[16] . لای "سەمیر ئەمین" ئەمە ئیشکالیاتی ((پەلکێشی سەرمایەداری)) یە کە بۆتە مایەی بلوککردنی کۆمەڵگەکانی ئێمە لە دواکەوتوویی و ((هەژاری فکری)) و لە میشەوە سەرهەڵدانەوەی ئسوولگەرایی یاخیبوون و ((هەڵگەڕانەوە لە مێژوو))[17] ا.

بۆ بەرچاوروونی زیاتر لەم ئیشکالیاتە، دیسانەوە پێمچاکە ئاماژە بەدوو تێزی روانین و هەڵسەنگاندنی ئەم ئیشکالیاتە بدەم کە خۆرئاواییین. خوێندنەوەی ئەم ئیشکالیاتە لای بیریارانی خۆرئاوا جیاوازە . لای بەشێك لەمان هیچ خوێندنەوەیەك نیە بۆ حەقیقەتی مێژوویی ، شوێنکاتی مێژوویی کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکان . من لێرەدا تەنها ئاماژە بە دوان لەم خوێندنەوانە ئەدەم ئەویش بە شێوەیەکی ڕاگوزەری. کە تێڕوانینەکانی "فۆکۆیاما" و "هانتنگتون".

لای "فۆکۆیاما" ئەمە ئیشکالیاتی ڕەوتی نەگەڕاوەی ((دیموکراتیزەکردن)) ی جیهان . و ((کۆتایی هاتنی مێژوو))ە. لەوێوە کە: "فۆکۆیاما" وەها دەڕوانێتە مێژوو کە نووسینەوەی ئەفکارەکانە، کە ڕسکان و بەر یەککەوتن و ((جەنگی ئەفکارە))[18] بۆ بالاکردنی زیاتری ((ئەفلانیەت و ئازادی))[19]، و وەها دەڕوانێتە ((گلۆبالیزەیشن)) کە دیاردە و پرۆسێکی تافی شکستی ئایدیۆلۆژیا و کۆتایی هاتنی جەنگی ئەفکارە. و لەودیووی ((گلۆبالیزەیشن ))ەوە ئایدیەیەکیتر نابینێت، ووەها وێنای ((لیبریالیزمی دیموکراسی))دەکات کە دوا قەدەری مرۆڤایەتیە، و لەمانەشەوە بانگەشەی ((کۆتایی هاتنی مێژوو)) دەکات . ئالێرەوە لای

"فۆکۆیاما" هەموو تیزە بەرەنگاریە لۆکالیزمیەکان وەها دەخوێندرێتەوە کە جگە لە نەنیشەی مێژونووسینەوەیەکی پێشگلۆبالیزمیشن و پێشمۆدێرنیتە، جگە لە یاخیبوون و خۆبەدەستەوەنەدان بە نەنیشەی کۆتاییهاتنی مێژوو شتێکیتر نین . "فۆکۆیاما" تافی گلۆبالیزمیشن وەها وێنادەکات کە ڕەوت و قەدەرێکە بۆ دیموکراتیزەکردنی جیهان. بەڵام ئەم پرۆسسە هەروا بەئاسانی و بێگرێوگۆڵ بەڕێوە ناچێت : لە لایەك لە نێوان تەکنۆلۆژیا و دیموکراسیدا لەخودی خۆرئاوادا ترازانێك هەیەو وەها وێنایدەکات کە ((ئەوکاتە تەکنۆلۆژیا دەبێتە مایەی خۆشگوزەرانکردنی ژیانی مرۆڤایەتی کە هاوشانی ئەو پێشکەوتن لە مۆراڵیشدا روودات ))[٧٠] ، لەلایەکیتریشەوە کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکان وەها وێنادەکات کە ناتوانن هەروا بە خێرایی تەسلیم بەم قەدەری دیموکراتیزمیبوونە ببن. بۆیەشە ئەزموونکردنەوەی سەرلەنوێی بەرفراوانی ((دیکتاتۆری و فاشیزمی و تۆتالیتاریزمی)) لەم کۆمەڵگەیانەدا دەبینرێ. وەك هەوڵێکی لۆکالیزمیانە بۆ دۆزینەوەو ئەزموونکردنەوەی ((شەرعیەت))ێکی دەسەلاتداری سیاسی لە دەرەوەی لیبرالیزمی دیموکراسی . لێرەوە "فۆکۆیاما" دێتە سەرباسی ئەو ترازانەو ئیشکالیاتەی لیبرالیزم : کە هەم ترازان یان پێکنەهاتنەوەی تەواوەتیانەی رووەکانی لیبرالیزمە وەك ((فکر)) و وەك ((ممارسە )) کە ئەوەی جێکەوتووە و جێگیربووە لەپرسی دیموکراتیزەکردنی جیهان زۆرتر ((سەرکەوتنی فکری لیبرالیزمیە نەك ممارسەی لیبرالیزمی ))[٧١] ، و هەم ترازان و پێکنەهاتنەوەی تەواوەتیانەی ((سیاسەت)) و ((ئابووری))یە ، ((توانینی ڕاڤەکردنی سەرکەوتنی لیبرالیزمی دیموکراسی لە بواری ئابوریدا وەك تاکە سستمێکی ئابوری کە توانای مانەوەی هەیە . و نەتوانین و ناسانەبوونی ئەم ڕاڤەکردنە لە بواری سیاسیدا ))[٧٢] .

لای "هانتنگتون" ئەم ئیشکالیاتە بەقەیرانی خۆشوناسیکردنەوە گوزارشتدەکرێت، بەلای ئەمەوە بازنەی شوناس و خودشوناسیکردنەوەکان

لەئێستەی جیهانداو بە رەهەندێکی جیهانییەوە داخراوی شوناسە ئەزموونکراو و زانراوەکانە ا، و لەمیشەوە ململانێ وەك ماکێکی رەسەنی مرۆڤایەتی وێنادەکات ا. تێڕوانینی وەهایە کە ئیتر بە دوای کۆتایی هاتنی تافی ئایدیۆلۆژیا ـ ، و شکستی ئایدیۆلۆژیا لە بەرێخستن و پێناسەکردنی ململانێکان ـ ململانێکانی نێوان کۆمەڵگە و دەوڵەتەکان و ناو کۆمەڵگە و دەوڵەتەکان ، و شکستی ئایدیۆلۆژیا لە دارشتنەوەی سیاسەت. لە شوناسیکردنەوەی کۆمەڵگەکان، دەوڵەتەکان، تاکی کۆمەڵگەو . ئیتر بەهۆی ئەم شکستەوە قەیرانێك دەرگیری تاکی کۆمەڵگە، کۆمەڵگەکان، جیهان دەبێت. و ئیشکالیاتێك سەرپێدەکەوێ کە ئیشکالیاتی خودشوناسیکردنەوەی نوێ، و قورسی و زەحمەتی ئەم پرۆسەی خودشوناسیکردنەوەیە. ئیشکالیاتی دۆزینەوەی فۆرمێکی نوێی ململانێ، و پەنتێکی نوێ بۆ ململانێ ا. ئیشکالیاتی دارشتنەوەی نوێی ((سیاسەت))ە . و وێناکردن و تێڕوانینەکانی "هانتنگتون" بۆ تافی دوای ئایدیۆلۆژیا وەهایە کە: ئیتر ململانێی گەورە لە نێوان شارستانیەتەکاندا دەبێت ، ئەو شارستانیەتانەی کە پێشتر مرۆڤایەتی ئەزموونیکردوون و لەفۆرمەکانی ئاین و کولتووورداو بەشێوەیەکی بەمیسۆلۆژیکراو بە ئەکتیڤی لەیادەوەرییە کۆمەلایەتیی و کۆمەڵگەییەکاندا جێنشینن. هەربۆیە پێیوایە کە ((شارستانیەتەکان درێژترین چیرۆکی واقیعی ))[٧٣] و ((حەقیقەتێکی ماوەدرێژن))[٧٤] . و لەوێشەوە کە (( شارستانیەتە سەرەکیەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بەرادەیەکی زۆر جووتی ئاینە گەورەکان بوون ))[٧٥] دەکرێ ئەم ململانێیە وەك ململانێی نێوان ئاینەکانیش پێناسە بکرێت . هەرچی ململانێی بچوکی ناو کۆمەڵگەو دەوڵەتەکانیشە . دیسانەوە لای ئەو ئیتر ململانێ ((لە نێوان چینەکۆمەلایەتیەکان ، لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندان)) نابێت، بەڵکو لە نێوان ئەوانەدا دەبێت کە نەژادو کولتووریان جیاوازە، سیاسەتیش ئیتر وەها دادەرێژرێتەوە کە ((سیاسەتی ناوخۆ سیاسەتێکی نەژادی ، و سیاسەتی گەردوونیش سیاسەتی

شارستانیەتەکان))[٣١] بێت : لەمانەشەوەو بەتێڕوانینی "هانتنگتون" ئەوە ئەنجامگیریدەبێت کە خودشوناسیکردنەوە خۆ چوارچێوەدان دەبێت لەناو شارستانیەت و کولتووروو ئاینەکاندا !، ((پێداگیری کولتوورییانەو سەربەرزکردنەوەی سەرلەنوێی کولتوور، و ڕەتکردنەوەی کولتووری خۆرئاوا)) دەبێت. لەدیدێکی ئاینی و کولتوورییەوە.

بەلای منەوە خوێندنەوەو تێگەیشتنەکانی "هانتنگتون" بۆ ئەم تافە (گەڕانەوەگەریە)، گەڕانەوەی کۆمەڵگەکان بۆ سیاسەت و ململانێ و شوناسەکانی پێش تافی ئایدیۆلۆژیاو تەنانەت پێشمۆدێرنیتەش، گەڕانەوەیە بەرەو مێژووی ڕابووردوو، بەرەو ئاین و کولتوور. کە بەمەش ئەم ئیشکالیاتە ئەو پێناسەیەش هەڵدەگرێت کە ((تەکاندنی عەلمانیەت لە جیهان ))[٣٢]، و کارایی تێزە رابردووگەریە لۆکاڵییەکان بێت .

بەم شێوەیە، ئەوەی بۆ شرۆڤەکردنی لۆکاڵیزەیشن و خوێندنەوەی شوێنکاتی مێژوویی کۆمەڵگە لۆکاڵیزەیەکان لە تێڕوانینی "فۆکۆیاما"دا وونەو ناوڕێلێنادرێتەوە، تایبەتمەندێتی ڕۆشنبیری ئەم کۆمەڵگەیانەیە کە لە لایەن میسۆلۆژیاوە داگیرو کۆنترۆل کراوە. و ئەوەی لە تێڕوانینەکانی "هانتنگتون"یشدا وونە پرسی دیموکراتیزەکردنە. ئەگەر لای "فۆکۆیاما" ترازانی (گلۆبالیزەیشن ــ لۆکاڵیزەیشن)ی جیهان وەرئەچەرخێندرێتە سەر(دیموکراسیبوون ــ دیموکراسینەبوون). ئەوا لای "هانتنگتون" ئەم ترازانە شارستانیانەو کولتوورییانەو ئاینییانەیە !.

## بەشی پێنجەم

(( ١ ))

هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆكرد، لە ئێستەدا كۆمەڵگەكانی لۆكالیزمیش ، بە قەیرانێك، قەیرانێكی قوڵی ((مێژوویی))دا، گوزەردەكەن . قەیرانێك كە تەواوی ژیانی كۆمەڵگەی گرتۆتەوە. و هەموو ئەو گرەو و مبادەرانەی بە كۆمەڵگە دۆرانـدووە كە لە مێژوودابوون و لە مێژوودامانەوەی سەردەمیانەی فەراهەمدەكەن .

لێرەوە هەموو ژیانی ((سەردەمیانە))ی كۆمەڵگە ، ڕاوەستانی مێژووییانەی كۆمەڵگە، لەسەر ئەوە ڕاگیرو ئەندێشە دەكرێت كە پرۆژەسازی خۆداڕشتنەوەی پای تێپەڕینی قەیران بكات . كە توانـاو هێزەكانی وەها ڕێكبخاتەوە و ئاراستەبكات كە دەربازی كۆمەڵگە بێت لە قەیران . بەر لەهەر هەنگاو وپرۆژەسازیەكی ئاوەهاش دەبێت پێناسەیەكی ووردی ئەو قەیرانە بكرێت و ستراكتۆری ئەو قەیرانە بدۆزرێتەوە . پرسیاری ئەوەبكرێت كە ئایە ئەمە قەیرانی پای چ شكستێكە؟، و دۆڕاندنی چ گرەوێكە؟. كۆمەڵگە دەبێت بۆ بردنەوەی چ گرەوێك خۆی ئامادەو دابڕێژێتەوە ؟ . ئایا بەر لە قەیران چ مبادەرەیەك لە ئیرادەو لە بڕیاری كۆمەڵگەدا بووە، كە ئیستا لەدەستیدابێت و لێیتەكێنرابێت؟. بە دیوێكیتردا، ئایا مبادەرە مێژووییەكان هەمیشە لە دەستی كۆمەڵگەیتردا نەبوون؟!. ئایا ئەوەی لەمبارەشەوە لە كۆمەڵگەی خوددا وێنادەكراو دەوترایەوە، تەنها ئەندێشەكردنێكی وەهمیانەی ئایدیۆلۆژیانەو میسۆلۆژیانە نەبووە ؟ . ئەم پرۆژەسازیكردنانە لە چ فەزایەكی مەعریفیداو لە ژێر كاریگەریەكانی چ مەعریفەیەكدا گوتاربێژیان بۆ دەكرێ و بەرێدەخرێن و بە مۆدیلیدەكرێن ؟ چ ئامانج و بەرژەوەندیەك

ئاوێنەدەکەنەوە ؟ . لەوێشەوە کە ئەم پرۆژەسازیانە، پرۆژەسازیکردنەوەی خودشوناسیکردنەوەن ، ئایا ئەم خۆدشوناسیکردنەوەیە لە ئێستەدا چ گرەوێکە ؟. گرەوێکی فەلسەفی و ئابووری و تەکنۆلۆژی و زانینگەریە ، یان گرەوێکی ئایدیۆلۆژی و میسۆلۆژی و کولتووری و ویژدانی و مۆرالی و رۆحی؟. لێرەوە، لە ناسینەوەو پێناسەکردن و وێناکردن و ئەندێشەکردنی ئەم گرەوەوە، میتۆدو روئیا لۆکالیەکانی ئیشکردن سەرپێدەکەون و لێکجیادەبنەوە و بەریەکدەکەون .

بۆ ساغکردنەوەی ئەم پرسیارانە دەبێت بگەرێینەوە بۆ خودی دیاردەی گلۆبالیزمیشن . بۆ ئەو پرۆسسە هوشیاریەی پشتەوەی رەوتگرتنی گلۆبالیزمیشن . پێموایە بەبێ تێگەیشتن لەم پرۆسسە هەر باسکردنێکی گلۆبالیزمیشن خولانەوە دەبێت لە نێوان ووتن و ئەندێشەو ئامارژەکانی لایەنگران و نەیارانی خودی دیاردەی گلۆبالیزمیشن . هەروەك هەر باسکردنێکی لۆکالیزمیشنیش خولانەوە دەبێت لە نێوان تێزە کولتووری / میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیەکانی خود شوناسیکردنەوەی لۆکالیانەو بەریەککەوتنی ئەم تێزانە .

وەك چۆن لەسەردەمی پیشەسازیدا بەبێ تێگەیشتن لە مۆدێرنیتە، لە رێنسانس و رۆشنگەری و ریفۆرمی ئاینی مەحاڵبوو مۆدێرنەو بنەچەی ئەو گەشەو هەڵکشانە بالایەی خۆرئاوا راڤەبکرێت. ئاوەهاش لە ئێستەی جیهاندا ، لە ئێستەی سەردەمی تەکنۆلۆژیاو زانیندا بەبێتێگەیشتن لە شۆرشی زانستی / تەکنۆلۆژی مەحاڵە پشتەوەی شکستی هەژموونگەری جیهانیانەی ئایدیۆلۆژیا. و ترازانی گلۆبالیزمیشن و لۆکالیزمیشنی جیهان و هەڵکشان و گەشەی بالای گلۆبالیزمیانەی خۆرئاوا ، راڤەبکرێت . لێرەوە، لەم تێگەیشتنەوە دەکرێت و دەتوانرێت پەیبەبنەچەو ستراکتۆری ئەو ((تحدی))یانە ببەین کە ئێستا کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکان رووبەرووی دەبنەوە. و بگەینە ئەو گرەوەی کە وەلامدانەوە بەم ((تحدی))یانە فەراهەمدەکات، ئەو فۆرمە لە دارشتنەوەی کۆمەڵگە کە ئەم وەلامدانەوەیە

دەیخوازێ، و ئەو میتۆدو روئیامەعریفیە وئەو پرۆژە کۆمەڵگەییە کە کۆمەڵگە بۆ ئەم وەلأمدانەوەیە سەرپێنەخات.

ئەگەر خۆرئاوا بۆ هەڵکشانی بەرەو کۆمەڵگەی ((زانین)) ((گلۆباڵ))، بناغەو بنەچەیەکی راستەقینە وتۆکمەی مۆدێرنە و مۆدێرنیتەی هەبووبێ. و لەم هەڵکشانەیدا بێ منافسیش بێت. ئەوا ئەمە، ئەم هەڵکشانە مێژووییە، بۆ کۆمەڵگە لۆکالیەکان وەهانیە:

- ئەم کۆمەڵگەیانە ئەگەر گەیشتبێتیشنە مۆدێرنە ئەمە لە بناغەو بنەچەیەکی مۆدێرنیتەیی مۆدێرنەوە نەبووە بەڵکو بەرهەمی نیشکردنی ئایدیۆلۆژیا بووە. کە واتاداری ئەمەش بالأ دەستبوونی مەعریفەی ئایدیۆلۆژییە لە رۆشنبیری کۆمەڵگەدا.
- یان ئەم مۆدێرنەیە وەهمی مۆدێرنەیی - مۆدێرنەبوون، ومۆدێرنەکردن - بووە. کە واتاداری ئەمەش بالأدەستبوونی فەزای مەعریفی پێشمۆدێرنیتەیی، و میسۆلۆژیانەیە لە کۆمەڵگەدا.
- هەبوونی جەمسەرێکی گلۆبالیزمیشن. کە لەگەڵ هەموو قسەخۆشەکانی بۆ یارمەتیدانی کۆمەڵگەکانی لۆکالیزمیشن تا لە قەیران ووەزعی لۆکالیزمیی دەرباز وتێپەڕبن. بەگردەوە بە ئاراستەی چەقگیریکردن و قووڵترکردنەوەی ئەم قەیران و وەزعیەتەیە.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆمەڵگەکانی لۆکالیزمیشن لەبەردەم دووتێزی ((تحدی)). دووتێزی هەنگاو، دووتێزی پرسی کۆمەڵگەیی و مێژوویی ومەعریفی جیاوازدان، یەکێکیان پرسی لۆکالی - خود لۆکالیی - هەنگاوی بەرگرتن لە داکشانی مێژوویی کۆمەڵگە، و ((تحدی))ی یۆتۆپیا رابردووگەریەکان، و ئەویتریان پرسی لۆکالیزمیشنی،

له دوانەیی ((گلۆبالیزمیشن – لۆکالیزمیشن))ەوە هەنگاوی بەرەو هەڵکشانی مێژوویی کۆمەڵگە، و ((تحدی))ی تەکنۆلۆژی وزانستیانە.[٢٨]

ئەگەر لەیەکەمیاندا کۆمەڵگە لە فەزایەکی لۆکاڵی وەهادا ئەم بریاری خۆدارشتنەوەیەی بۆ بەرگرتن لە داکشانی کۆمەڵگە، سەرپێو بەرێنەخات کە بەتەواوی لە ژێر کاریگەری و مۆنۆپولیزمیی دەسەڵاتی رۆشنبیریانەی مەعریفەی میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیەندایە. و لەبەرامبەر ((منافس))، منافسێکی لۆکاڵی بەهێزی وەهادایە کە تا ئێستاش بە ((رەفضی))ماوە. منافسێك کە تا ئێستاش لەپرۆسسێکی بەردەوامی خۆ بەرهەمهێنانەوەی ((تەفلیسی)) و ((عەقیلەیی))انە دایە. وخۆی بە ((بازنەی قەدەغەیی بیرلێکردنەوە))[٣١] کردووە، وپێگەیەکی بەهێزی کۆمەڵایەتیانی هەیە، و ئامادەنیە بچوکترین ((تنازل)) لە دەسەڵات و مۆنۆپۆلیزمیی ((شەرعیەت))ی مێژوویی و رەمزی و میسۆلۆژیانەی، و لەو داگیرکردن و کۆنترۆڵیکات کە بەسەر یادەوەریی مێژوویی و کۆمەڵگەیی وکۆمەڵایەتی کۆمەڵگەدا هەیەتی. ئەوا لە دووەمیاندا کۆمەڵگە لە فەزایەکی جیهانی وەهادا ئەم بریاری خۆدارشتنەوەیەی، بۆ هەڵکشانیمێژوویی کۆمەڵگە بەرێنەخات. کە بەتەواوی لە ژێر کاریگەری و مۆنۆپۆلیزمیی رۆشنبیری و مەعریفیو تەکنۆلۆژی وزانستی وئابوری دارایی وبازرگانیی کۆمەڵگەکانی گلۆبالیزمیشندایە. ولەبەرامبەر منافس، منافسێکی جیهانیی، وەهادایە کە خۆی وەك دوامۆدیل و دواقەدەر و دوائایندەی کۆمەڵگەی مرڤایەتی وێنا و پێناسەدەکات . و ئامادەنیە بچوکترین ((تنازل)) لە باڵا دەستی جیهانیانەی، و لەو فەرمان و بەرژەوەندیانەی بکات کە بەردەوامیدانە بەترازانی جیهانیانەی ((گلۆبالیزمیشن)) و ((لۆکالیزمیشن))، و ناتەبایکردنی زیاتری پەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوانە و قوڵکردنەوەی زیاتری ئەم ترازانە .

لێرەوە، و بەبۆچوونی من، ئەگەر بیریارانی کۆمەڵگەکانی لۆکاڵیزمیشن، بەتایبەتیش بیریارە عەرەبەکان باس لە زەرووڕەتی

پرۆژەسازی : بەمۆدێرنێتەکردنی مەعریفەی عەرەبی ، و ((ڕۆشنگەریکردن))ی ڕۆشنبیری عەرەبی، و تەکاندنی تێڕوانین و ڕەگەزە میسۆلۆژی و ئامێژوویی و بان کۆمەڵگەییەکان لە کولتوور، باس لە تەوزیفکردنی مەعریفیانەی کولتوور و بە هەیکەلیکردنەوە و دارشتنەوە و خوێندنەوەی سۆسیۆلۆژی /مێژوویانەی کولتوور دەکەن. ئەمە تەنها هەنگاوێکە، هەنگاوێکی گرنگ و سەرەکی و یەکەمیی بۆ بەرگرتن لە داکشانی کۆمەڵگە، بۆ پرسی لۆکاڵی و شەڕکردنی مەعریفیانەی میسۆلۆژیا و ئایدیۆلۆژیا . لەدوای ئەمەوە هەنگاویترهەن بەرەو هەڵکشانی مێژوویی کۆمەڵگە ، بەرەو ((زانینبوون /تەکنۆلۆژیبوون)) . هەنگاویتر هەن بۆ دارشتنەوەیەکی وەرچەرخانئامێزی کۆمەڵگەیی وەها کە گواستنەوەی کۆمەڵگە بێت لە حاڵەتێکی لۆکالیزەیشن و ئیرادە نیگەتیف و کارتێکراوەوە بەرەو بەشداریەکی ئەکتیڤانە لە شۆڕشی زانستی /تەکنۆلۆژی ، لە مێژوو نووسینەوەی سەردەمیانەی جیهان. ئەمەش بەومانایەی کە ((تحدی))کانی بەردەم کۆمەڵگە تەنها بەرگرتن لە داکشانی مێژوویانەی کۆمەڵگە نییە، بەڵکو هەوڵ و پێویستبوونی هەڵکشانی مێژوویانەی کۆمەڵگەشە.

دواجار دەبێت ئەوە بڵێین کە ئەم دوو تێزیکردنە مێژوویی و کۆمەڵگەیی و مەعریفیەی پرس و هەنگاو و ((تحدی ))کانی بەردەم کۆمەڵگەکانی لۆکالیزەیشن . هەرگیز بە مانای ترازانی ئەم دوو تێزەییە و جیاکردنەوەیان نیە لە یەکتری. بەمانای پێشکەوتن و پاشکەوتنی یەکێکیان و بەدوای یەکدیدا هاتنیان نیە. بەمانای دوو تێزیکردنی دارشتنەوەی کۆمەڵگە نیە، دارشتنەوەیەك بۆ تێپەڕینی پرسی لۆکاڵ، و ئەمجا دارشتنەوەیەکیتر بۆ تێپەڕینی پرسی لۆکالیزەیشن. پرۆژەسازی ئەم دووتێپەڕینە یەك دارشتنەوەی مەعریفیانەی کۆمەڵگەییە. تێپەڕینی پێکەوەیی ئەم دوو پرس و ((تحدی))یەیە بە یەکشەڕی مەعریفی فرەبەرە.[٨٠]

بۆ ئاسانی تێگەیشتن لەم تێڕوانینەش دەڵێم : ئەگەر کۆمەڵگەکانی لۆکالیزمیشن بۆ پرسی لۆکالی لەبەردەم منافسێکی لۆکالی بەهێزدان ، کە هەموو فەرمان و بەرژەوەندی و ئەندێشەکانی بۆ داکشانی مێژوویی کۆمەڵگەو چەقگیرکردنی کۆمەڵگە لە قەیران و لە قەزای مەعریفی میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیدایە . ئەوا بۆ پرسی لۆکالیزمیشنیش لە بەر دەم منافسێکی جیهانی بە هێزدان کە فەرمان و بەرژەوەندی و ئەندێشەکانی ئەویش ، هەمان ئاراستەی ، ناچار کردنی کۆمەڵگە بە داکشانی مێژوویی و چەقگیرکردنێتی لە قەیران و لە قەزای مەعریفی میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیدا . بە واتایەك دوو ئاراستەی دژ بە یەك و جیاوازن بەرەو ((پنتێك))ی هاوبەشی بەرژەوەندی . کە ((قوربانی سەرەکی تیایدا ، کۆمەڵگەیە)).

(( ٢ ))

کاتێك باس لە کۆمەڵگەکانی لۆکالیزمیشن دەکەین – هەروەك پێشتریش باسمانکرد، دەبێت ئاوڕ لەو حەقیقەتە بدەینەوە کە دوو تێزی لۆکالیزمیشن، دوو دەستە کۆمەڵگەی لۆکاڵ هەیە : دەستەیەك گرەوی ((پیشەسازیبوون))ی بردۆتەوە ، بەلام لە تێپەڕینی ئەمە بەرەو ((زانینبوون /تەکنۆلۆژیبوون))، بەرەو ((کۆمەڵگەی زانین/تەکنۆلۆژی )) شکستیهێناوە ، و دەستەیەکیش لە هەنگاوە بەراییەکانی ((پیشەسازیبوون)) دایە، یان دروستتر چەقگرتووی قۆناغی گواستنەوە بەرەو پیشەسازیبوونە . بەواتایەکیتر، دەستەیەك گرەوی ((زانینبوون / تەکنۆلۆژیبوون ))ی دۆڕاندووە، لۆکالیزمیی پلە ((یەك)) و دەستەیەکیش گرەوی ((پیشەسازیبوون))ی دۆڕاندووە – لۆکالیزمیی پلە ((دوو)) –. لێرەوە ئەم دوو تێزمیکردنە لۆکالیزمییە ، دووتێزیکردنێکی ئاستی

جیاوازی گەشەی کۆمەڵگەکان، دووتێزیکردنێکی مێژوویی و کۆمەڵگەیی و مەعریفیانەی ئێستەی لۆکاڵیزەیشن و قەیرانەکانی پای لۆکالیزەمیبوونە ، لەم دوو تێزیکردنەشەوەو هەر لەناوخودی ئەم کۆمەڵگەیانەوە، دەبێت باس لەدووجۆرە خوێندنەوە و پرۆژەسازیکردن و ئەندێشەکردنی تێپەڕینی قەیران لەم کۆمەڵگەیانەدا بکەین، یەکێکیان پرۆژەسازی و خوێندنەوەی لۆکاڵیانە کە خۆڕاگیرکردنەوەو خۆداخستنەوەیەکی لۆکاڵیانەی ئەبستراکت . و خوێندنەوەیەکی ((دوێنێ)) بیانەی میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیانەی قەیران ، و خۆقۆزاخەدان و خۆچەقگیرکردنەوەیە لە دۆخی لۆکاڵیانەدا ، کەیەم یان بەو تێزڕەوی و ئاستە داکشانی مێژوویانەی کۆمەڵگەیە. و بەتێزەکانی ئەندێشەی ((بەرهەنگاری)) و ((ئسوولگەری)) گوزارشتی لێدەکرێت، وئەویتریش پرۆژەسازیکردنی تێپەڕینی لۆکاڵیزەیشنە. خوێندنەوەیەکی ((ئێستەیی)) و سەردەمیانە، مەعریفیانەی قەیرانە بە ئاراستەو ئامانجی هەڵکشانی مێژوویانەی کۆمەڵگە.

لەمەشەوە دەگەینە ئەوەی کە ئەگەر ئەم کۆمەڵگەیانە بۆ هاتنەوەی پای مێژووییبوونی سەردەم ، پای مبادەرەی مێژوویانە ، لەبەردەم یەکگرەو یەکتێزی ڕووبەڕووبونەوەی جیهانیدا بن . کە گرەوی ((زانینبوون /تەکنۆلۆژیبوون)) و ڕووبەڕووبونەوەی دەرهاویشتەکانی شۆڕشی ((تەکنۆلۆژی / زانستی)) یە ، بە دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن – لۆکاڵیزەیشن)) ەوە. و لە مەشەوە پرۆژەسازیکردنی هەڵکشانی کۆمەڵگە و تێپەڕینی قەیران ، یەکتێزی بێت . بە جیاوازی ژمارەی هەنگاوەکانی ئەم هەڵکشان و تێپەڕینە لە کۆمەڵگە لۆکاڵیزەمییە پلە یەك – باڵادەستی ئایدیۆلۆژیا – و پلە دووەکاندا – باڵادەستی میسۆلۆژیا -. ئەوا هەر ئەم کۆمەڵگەیانە بۆ خۆداخستنەوەی لۆکاڵیانە ، بۆ گرەوی ((میسۆلۆژی و کولتووری و ئایدیۆلۆژیبوونەوە ))، بۆ بەعەقیدەییکردنەوەی کۆمەڵگە و بە کۆمەڵگەییکردنەوەی عەقیدە . بۆ پرۆژەسازیکردنەوەی داکشانی کۆمەڵگە . بۆ گوزارشتکردن، تەنها گوزارشتکردن لە قەیران لە بەردەم

چـەند تـێزێکی گـرەوی ((هەڵگەڕانـەوە)) و ((دەرچـوون)) لـە مێـژووی سەردەم و گرتنەبەری لارێی مێژوویی، و لەبەردەم شـەڕی کۆمەڵایەتیانـەی ئەم تێزانەدا دەبێت . بە جیاوازی گرەوی مێژوویی داکشان، و جیاوازی ئەم تێزانـە، و باڵادەستی مـەعریفی و ڕۆشـنبیری کـام تێزەیـان لـە کۆمەڵگـە لۆکاڵیزیپە پلە ((یەك)) و پلە ((دوو))ەکاندا.

(( ٣ ))

بەگشـتی خەسـڵەتی دۆخـە قـەیرانگرتووەکانیش وەهایـە ، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگەکانی ئێمـەدا ، کە بـەهۆی لێڵبوونـی ناراستەکان و تێکچوونـی پارسـەنگی و پێوانـەکان بـۆ ناسـینەوە و ناونـانی نـاوی ڕاستەقینەی شتەکان ، و بۆ پەیبردن بە بنەچەی قەیران و ڕەهەندەکانی قەیران ، و هەژاری فکری و مەعریفیانە بۆ دەستبەرکردنی تێڕوانینێکی دەسـتەجەمعی، وەهایـە کـە ناراسـتەکانی بـەرەو نیحتیواکردنـی نێستەییەکانی قـەیران و تێپـەڕکردنی ئـەم قەیرانـە بێـت. و بـەهۆی هەژارکەوتنەوەی واقیع لـە یۆتۆپیـای بەختـەوەرکردنی مرۆڤەکان. خـەڵك پەنادەبەنـەوە بەرئەندێشـە. بـەواتای ئەندێشـەکردنی بەختـەوەربوون لـە دەرەوەی واقیع و نێستەی کۆمەڵگە. ئەندێشەیەك کە میسۆلۆژیا چوارچێوە و هێڵەگشتیەکانی دەکێشێ، و کۆمەڵگـە و دەستەکۆمەڵایەتیەکان دێنێتـەوە پـای قەناعـەتێکی پاڵدانـەوەی ((سـەرمایەی ڕەمـزی)) یانـەو ئەندێشەکردنەوەی دۆزینـەوەی واتاکانی ((بـوون)) لـەم سـەرمایەوە . کـە کانگایـەکی لەبننـەهاتووی یادەوەریکردنـەوەی سـەروەری و شـانازیەکانە. سەرمایەیەك کـە هـەموو نـەوەکانی نەتـەوەو بەتایبـەتیش ((نەوەیـەکی هـەڵبژاردە)) لەبەرهەمـهێنان و زۆرکـردن و کەڵەکـەکردنیدا بەشـدارن. کاتێکیش باس لە ئەندێشە دەکرێت دەبێت لەوێوە بێت کە،

١) ئەندێشە تایبەتی ئەم یان ئەو کۆمەڵگە و ڕۆشنبیریە، ئەم یان ئەو شوێنکاتە مێژووییەی کۆمەڵگە نیە. ((ئەندێشە ڕەهەندێکی بنچینەیی هەر ڕۆشنبیری و کۆمەڵگەیەکە ))[٨١] و((دەخاڵەتدەکاتە گشتیی کۆمەڵایەتیی مێژوویی ))[٨٢]. وکۆمەڵگەکان چەندی لە ڕووی مەتریالیەوە، و چەندی لە بەئەقڵانیکردنی ڕۆشنبیریشەوە هەڵکشابن. ناتوانن ئەندێشەو میسۆلۆژیا لە هێزی ئامادەبوونەوەی بەردەوامیان لەناو کۆمەڵگە دابڕن. ناتوانن ئەندێشە لە یادەوەریکردنەوە مێژووییەکان، لە دەوڵەمەندکردنی نێستەییانەی سەرلەنوێی دارشتنەوەی ئەم یادەوەریانە دابڕن . بەواتایەکیتر، کۆمەڵگە خۆی دەبێتەوە ئەو زایەنگەیەی کە ئەك هەر ئەندێشەکان دەزێنێتەوە، بەڵکو روخسارەکانیشی جوانترو فانتازیتر دەکات. و هەمیشە بە پۆشاکێکی وەها نمایشیدەکات و خۆی پێنمایشدەکات کە ئەفسوونێك بداتە خۆی، و بداتە یەکێتییە ناوەکییەکانی خۆی، و بەسەرنجراکێشانی ڕۆڵەکانی بۆ ئەم ئەفسوونە ئەو یەکێتییە ناوەکییە بپارێزێت کە هیچ کۆمەڵگەیەك و لەژێر کاریگەری هیچ فشارو زۆربۆهێنانێك و ئەهامەتیەکدا ئامادەنییە دەستبەرداری بێت. لەم ئەرك و پێداویستییەوە کە بەئەندێشە دەدرێت، دەکرێت ئەندێشە وەك توخمێکی ئەو سستمە پێناسەبکەین کمبوونی کۆمەڵگەو بەپێوەراوەستانی کۆمەڵگەو تەنانەت توخمێکیش لە سستمی شوناسی کۆمەڵگە پێکدێنێ.

٢) (( وێنـاو سـیمیۆلۆژیا ئەکتیڤە زهنییەکانی ئەندێشە. ئەگەرچی هەسپێکراو و واقیعیش نین و لەسەر تەرزی ئەقلیش سیستماتیزە نابن . کەچی لە کاتی هەڵکشانیاندا لە واقیع واقیعیترن . ئەمەش بەوەی کە ئەو ممارەسە تاك و دەستەجەمیانە ختوکە ئەدەن کە کاریگەریان هەیە )) [٨٣] بەواتایەکیتر ئەندێشە ((دیاردەیەکی ئەنترۆپۆلۆژی وەهایە کە کاریگەری مەتریالیانەی هەیە )) [٨٤]. ئەمەش بۆخۆی بناغەیەکە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتیانەی ئەتنیی و ئاینین. کە بەبێ هیچ پاڵدانەوەیەکی مەتریالیانە، هێزوگوڕێکی وەها

نووستوو بەخەبەر دەهێنن، و سوپاگیرییەکی کۆمەڵایەتیانەی وەهایان بۆ فەراهەمدەبێت ، کە لەوانەیە هیچ راڤەکردن و لۆژیکێکی ئەقڵانی پەیبەنهێنیەکانی نەبەن. هەروەك راڤەکردنی هەموو ئەو خۆبەختکردنانەشە کە لەم بزووتنەوانەدا دەبیندرێن، و کەسی خۆبەختکردوو یا ئامادە بۆ خۆبەختکردن بێهیچ پرسیارێکی مەتریالی یان زانستی بەرەو پیری مەرگدەبێتەوەو بۆ مەرگ هەنگاودەنێت.

٢) دەوڵەمەندی کۆمەڵگەکان، خۆراگیرکردنەوەی کۆمەڵگەکان تەنها بە ((سەرمایەی مەتریالیانە )) یان پێوانە ناکرێت، بەڵکو بە سەرمایەی رەمزیانەشیان. بەو واتایەی کەلەناو هەر کۆمەڵگەیەکدا بەبێناوردانەوە لەتواناو هێزی مەتریالیانەی خۆی و (ئەویتر)دا هێزێکی نووستوو هەیە کەلە بچووککردن و هەتککردن و بریندارکردنە رەمزیەکانیدا بەرادەیەك سەرپێدەکەوێت، کە پێوانەی مەتریالیانەی بۆ ناکرێت. لە هەر نەتەوەو کۆمەڵگەیەك دا مۆدیلێکی ئیدیالی مێژوویی، هەیە کە لە هەموو مۆدیلەکانی بالآتر وێنادەکرێت . و بەردەوام ئەم مۆدیلە لە (( شفرە )) ناردنندایە، و نەك هەر رووبەرێکی فراوانی یادەوەریە مێژووییەکان، شانازی و سەروەریەکانی ئەو کۆمەڵگە و نەتەوەی رەنگکردووە، بەڵکو لە ئێستەشدا لە رێی ئەو شفرە ناردنە بەردەوامەیەوە جێگەیەکی دیاری لە جووڵە مێژووییەکاندا هەیە. ((سەرمایەی رەمزی هێزێکی مەتریالیی گوشاردانەرە . و رۆڵێکی بەرچاو دەگێرێ لە جوڵاندن یان ستاپکردنی مێژوو))[٨٥].

بەم پێشەکیەوە دەبێت وەها باس لە ئەندێشە بکەین کە تەنها ئەو خانەبەندیکردن و ئەو تیژە راڤەکردنەی نیە کە تیۆلۆژیا و میتافیزیکییەت پێیدەبەخشن. تەنها ئەو تەوزیفکردنە میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیایەی نیە کە لە کۆمەڵگەکانی وەك ئێمەدا، تا ئێستاش بە زندوویێتی و بە ئەکتیفی هەیە. هەر ئەمەش بۆخۆی بەواتای هەم دوو تێزبوون ئەندێشەیە، دوو تێزبوونێك کە لە سەر رادەی بەشداربوونی

ئەقلانیەت وسۆسیۆلۆژیبوون و  مێژوویبوون لە پێکهاتەیدا، و رادەی بەمیسۆلۆژیکردنی  ئەم بەشداریەو نێگەتیڤکردنی لە ئاست ئیرادەیەکی بۆزەتیڤی بالای بانکۆمەڵگەیی و بانمێژوویی. وهەم دووتێزیکردنی تەوزیف و بەرجەستەکردنەوەی ئەندێشەیە. کەلەسەر ئامانجەکانی پشتەوەی ئەم تەوزیفکردن و بەرجەستەکردنەوەی رادەوەستێت. کە ئایا بۆ هەڵکشانی مێژووییانەی کۆمەڵگەیەکە یان هەڵکشانی کۆمەڵایەتیانەی ئەم یان ئەو ئایدیۆلۆژیاو گرووپە ئارتۆدۆکسیەیە. لێرەوە و بەم بەرچاوروونییە راگوزەرییە دەکرێت  یۆتۆپیاش هەڵسەنگێندرێ. وەك ئەو تێزە لەئامادەکردنەوەو تەوزیفکردنەوەی ئەندێشە کە ئایدیۆلۆژیانەیە، و بۆ سەرخستنی بەرژەوەندیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتی وعەقیدەیەکە. یۆتۆپیا بەومانایەی کە ئەگەرچی  مەنزوری زەمەنی و مەعریفی ئەو لەئێستەدانیە، کەچی بنەچەیەکی خۆڕاگیرکردنی هەیە بەوەی کۆمەڵگەیەك هەیە بەهۆی دۆڕاندنی گرەوە مێژوویەکانی و ((بەهۆی گەشەنەسەندنی راستەقینەی سەرمایەی مەتریالیانەی، و بەردەوامی هەرەشەکانی برسێتی‌و هەژاری‌و جەنگ  لەسەری. بەهەموو توێژەکانیەوە خۆی رابڵبەندێکی ئۆرگانیی جەستەییانە دەکاتەوە بەسەرمایە رەمزیەکەیەوە)) [٨٦]. بەلام یۆتۆپیا تەنیا ئەم تێزو ئاراستە رابردووگەرییەی نیە، بەڵکو تێزو ئاراستەی ئایندەگەریانەش.

(( ٤ ))

بۆچی بەرەنگاری ؟!

بەرەنگاری لە بەرامبەر چی و کێ ، و لە پێناوی چیدا ؟!.

ئەمە ، ئەو پرسیارەیە کە دەبێت بزووتنەوە ((بەرەنگاری))یە لۆکالیەکان ، حزب و دامەزراوە سیاسی وفکریەکانی ئامادەکردنەوەی

ئایدیۆلۆژیا و کولتوور، فۆرمە مۆرالگەر و ئیدیالگەرەکانی تێگەیشتن لە سەردەم ، و دواجاریش کلتوورگەر و ئایدیۆلۆژیگەرەکان وەلامیێدەنەوە. لێرە، لەم کۆمەڵگەیانەدا - لۆکالیزمیی پلە دوو - ئەگەرچی تێڕوانینی باوو سەرەکی و بالادەست بە ناراستەی چوونیەککردن و پێکدیچواندنی گلۆبالیزمیشن و کۆلۆنیالیزمە . ولەمیشەوە هەوڵی ئامادەکردنەوەی دۆخی سیاسی – کۆمەڵگەیی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی، و ڕەواجیدانەوە بەتێزەکانی ((بەرەنگاری)) و واتاکانی ئەوسەردەمەی ((بەرەنگاری))، ئەدرێت. بەلام لە نێوانی ئێستا و ئەو سەردەمەی کۆمەڵگە دابڕانێك هەیە، کە مێژوویی و کۆمەڵگەیی و تەنانەت مەعریفیشە. لە نێوان کۆلۆنیالیزم و گلۆبالیزمیشنیش لانیکەم جیاوازی لە میکانیزمەکانی بەرێخستنیاندا هەیە. لەم دابڕان و جیاوازیانەوە، ئەگەر ((بەرەنگاری)) سەردەمی کۆلۆنیالیزمی یەکرێزیبوون و یەکرێزیکردنی کۆمەڵگە – ئەتەوە - بووبێ. خودی حەقیقەتی کۆلۆنیالیزمیش وەك هێزێکی عەسکەری داگیرکار و هێرشهێنەر بنەچەی ئەم تێزە بەرەنگاریە بووبێ. و واتایەکی مێژوویی و کۆمەڵگەیی شۆڕشگێڕیتی و تەنانەت پێشکەوتنخوازی دابێتە ((بەرەنگاری)) . و هەر بەڕاستیش ئەمە شەڕێکی کۆمەڵگەیی سیاسی و عەسکەریانە بووبێ، شەڕی کۆمەڵگە بووبێ لەگەڵ دەرەوەی خۆی. ئەوا لە ئێستەدا، و لە حەقیقەتی گلۆبالیزمیشنەوە، ئەو ((بەرەنگای))یەی کە ئێستا بانگەشەی بۆ دەکرێ و پرۆژەسازی سیاسی و کۆمەلایەتی و فکریانەی بۆ دەکرێ . ترازانی ئەم یەکرێزیەیە، و فرەتێزبوونیی، و بەرامبەریەکدیوەستان و شەرکردنی یەکتریانەی ئەم ریزو تێزە فرە و جیاوازانە. وگومان و پرسیاری شۆڕشگێڕیتیبوونێتی لە بەرامبەر گلۆبالیزمیشن!. و وەرچەرخانێتی بۆ شەڕێکی ڕاستەقینەیی ناوخۆیی کۆمەڵگە. لەمەشەوە ئەگەر لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمیدا پرسی خودشوناسیکردنەوە پرسێکی بەرەنگاریانەی گشتیی کۆمەڵگەیەك بوو بێت لە بەرامبەر هێزێکی دەرەکی ، ئەوا لە ئێستەدا ئەم پرسە دابەشی کولتوور

و ئاین و ئەتنیك و ئایدیۆلۆژیا جیاوازەكان بووە . هەر هەموو بە جیاو لە ئەندێشەكردنێكی جیاوازەوە لە بەرامبەر گلۆبالیزەیشن و لە بەرامبەر یەكتریدا لە خودشوناسیكردنەوەدان . بەلاّم ئەوەی زیاتر جێكەوتووە و زۆرترین دەرفەتی كۆنترۆڵكردنی ڕۆشنبیری كۆمەڵگە و ژیانی سیاسی كۆمەڵگەی بەركەوتووە و كاریگەری راستەقینەی لەسەر مێژوونووسینەوەی كۆمەڵگە هەیە . و سیاسەتكردنی ڕاستەقینەی كۆمەلاّیەتیانەی ئێستەی كۆمەڵگەیە، جۆری دووەمی خودشوناسیكردنەوەیە – خود شوناسیكردنەوەی لۆكاڵیانە – . ئەگەر ئاوڕێكیش، ئاوڕێكی ئاماژەگەریش لە جۆری دووەمی خودشوناسیكردنەوە – خودشوناسیكردنەوەی لۆكاڵیزەیشنانە - وەك دوانەییەكی ((گلۆبالیزەیشن – لۆكاڵیزەیشن ))بدرێتەوە . ئەوا بنەچەو پشتەوەییەكانی ئەم ئاوڕدانەوەیە بۆ دۆزینەوەیەكیتری بیانوو و شەرعیەتی شەڕكردنی یەكترییە . لێرەوە دەكرێت ئەوە بڵێین كە ، ئەگەر ئەم فۆرمە ((بەرەنگاری))یەی ئێستا لە بەرامبەر گلۆبالیزەیشن، ((بەرەنگاری))یەكی نێگەتیڤی، فۆزاخەگەری بێت. ئەوا بۆ ناو كۆمەڵگە شەڕێكی راستەقینەی نەك هەر مەعریفی بگرە كۆمەلاّیەتی ناوخۆییە، و تێزەكانی ئەم ((بەرەنگاری))یە ئەوەندەی ئاوڕ لەیەكتری ئەدەنەوە و شەڕی یەكتریدەكەن و یەكتری دزێو و ناشرین و زینۆساید دەكەن، ئەوەندە ئاوڕدانەوەكانیان لە گلۆبالیزەیشن نیە؛ بەواتایەك شەڕكردنی ڕاستەقینە، ئاوڕدانەوەی ڕاستەقینەی ئەم تێزە بەرەنگاریانە لەیەكترییە، نەك گلۆبالیزەیشن. هەریەكە دەیەوێت شەرعیەتی كۆمەلاّیەتی و كۆمەڵگەیی و مێژوویی لەویتر داگیر و مۆنۆپۆلیزە بكات . ولەمەشەوە وێناكردنەكانیان بۆ یەكتری دزێوكردن، و هەڵوێستیان لە یەكتر ((نفی))كردن، و سیاسەتیان لە بەرامبەر یەكتری پاكتاوكردنە. لێرەوە و بەم تێزی بەرەنگاری و ئەندێشانەوە تەواوی بەهاو رەوزە مرۆڤایەتیە بالاّكانی كولتوور و مۆدێرنیتە دەكەونە بەر شالاّوێكی توندی ناشرینكردن و دزێوكردن.

واته یەکەم، ئەم تێزی بەرەنگارییانە، لە ڕاستیدا تێزی خود شوناسیکردنەوەی جیاوازان . تێزی خۆدارشتنەوەی جیاوازن بۆ ((تحدی))کردن و شەرکردنی یەکتری، بۆ مونۆپۆلیزەکردنی دارشتنەوەی ئێستەییانەی کۆمەڵگە . بەلام ئەوەی لەم حاڵەتەدا وونەو هەلوێستەی جدیانەی لەناستدا نــاگرێت و ئاوڕیلێنادرێتەوە پرۆژەی مەعریفی/سەردەمیانەی دارشتنەوەی کۆمەلگەیە . حەقیقەت و خەسڵەتی ئەم حاڵەتانەش، حاڵەتەکانی هەلچوون و سەرکردنی حەماسەت، حەماسەتی خودشوناسیکردنەوەی ((بەرەنگاریان))ە، جا چ ئەمە لەناو خودی کۆمەڵگەیەکدا بێت، یان لە بەرامبەر دەرەوەی کۆمەڵگە، وەهایە یەکەم، ئەوەی کەمترین دەرفەتی رسکان و خۆسەلاندنەوەی بەر دەکەوێت پرۆژەی بە ئەقلانیکردنی دارشتنەوەی کۆمەڵگەیە. و دووەم، ئاوردانەوەکانی ئەم بزووتنەوە لوکاڵیانە لە گلوبالیزەیشن و پێشداوەری و تەنزیریان بۆ رافەکردنی گلۆبالیزەیشن ، زۆرتر گووتارگەری و ئاماژەگەریە. لەو ئامار و ژمارانەوە دەستپێنەکات کە دەرهاویشتەو ئاکامی گلۆبالیزەیشن و ڕەوتگرتنی ئەم دیاردەیەن نەک لە بنەچەی گلۆبالیزەیشنەوە. کە ئەمەش دووبارەکردنەوەیەکی ئسوولگەریانەی مێژووی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی ئەم کۆمەڵگەیانەیە ؛ بەوەی لە بریتی تێگەیشتن، هەوڵ و پرۆژەی مەعریفیانە بۆ تێگەیشتنی ((دژ))، تێگەیشتنی ((بەرامبەر))، ئاسانترین ئەریت و ڕێگە پەیرە و دەکرێت کە ئەویش بەرێخستنی ((بەرەنگاری))یە ، ڕەواجیدانەوە بە ئەندێشەی ئەوەی کە هەوڵەکانی ((دژ))، ((دوژمن)) بۆ بچوکردنەوەی گرەوی هەبوونی ((منە)) ا، ڕەوتێك هەیە ئەمە ئاراستە و ئامانجێتی لەبەرامبەر (من) و بۆ (من)، بۆیە سازترین بەرووداوەستانەوەیەکی ئەمە بەرەنگاربوونەوەیە. ((بەرەنگاری)) بچوکنەبوونەوەا!. ئەمە لەبریتی پرۆژەسازیکردنی خۆگەورەکردن و خود هەڵکشاندن . هەمیشەش ئەو ((بەرەنگاری))یانەی کە لە بەرامبەر هێزێکی گەورەدا بەرێدەخرێن تا ئەوپەڕی ڕادیکالیستی

دەبن، و گرەوەکانی زۆرتر سیاسی / ئایدیولۆژی دەبن، نەك مەتریالی / ئابووری و مەعریفیی، ئەگەر لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمیدا تێگەیشتن لە گرەوی مێژوویی لاسەنگانە بووبێت، ڕاگرتنی ئەمە بووبێت لەسەر تەنها گرەوی سیاسی / ئابوری: بەرەنگاری سیاسیانە، ڕژێمی سەربەخۆیی سیاسی. تەنمیەی ئابوری. نەك لەسەر گرەوی فەلسەفی، گرەوی مۆدێرنیتەش. بەوتایەك مۆدێرنەکردنی ئایدیولۆژیانە بووبێ، نەك مۆدێرنەی مۆدێرنیتەیی. تێگەیشتن بووبێ لە خۆرئاوا لە دواپێگەیشتنە سیاسیەکانیەوە، نەك بنەچەی هەڵکشانی بەرەو ئەم پێگەیشتنەی. و ئاکامیش دۆڕاندنی ئەم گرەوە بووبێت. ئەوا ئێستاش هەمانە تێزی تێگەیشتن، هەمان مێژوو دووبارەدەکرێتەوە بەلام ئەمجارەیان بەئەندێشەکردنێکی پۆتۆپیانەتر: ڕاگرتنی ئەم گرەوە لەسەر تەنها سیاسەت، سیاسەتێکی ئیدیالگەری ڕاگیراو لەسەر سستەمەکانی ((ویژدان، مۆراڵ))ا. و کورتکردنەوەی ترازانی جیهانیانەی دوانەیی ((گلۆبالیزەیشن – لۆکالیزمیشن))ە لە تەنها فەرهەنگ و بەها، و هێرشی فەرهەنگی و بەهایدا. و لەمەشەوە لەبریتی تێگەیشتنی مەعریفیانە لە گلۆبالیزەیشن و گەڕانەوە بۆ بنەچەی هەڵکشانی گلۆبالیزمیانەی خۆرئاوا ، کە دەکرێت لە مۆدێرنیتەی مەعریفی و تەکنۆلۆژیکردنی مەتریالیانەی کۆمەڵگەدا کوورتبکرێتەوە. ((بەرەنگاری)) بەڕێدەخرێت. و ئاکامی ئاسایی ئەمەش بەلای منەوە هەردەبێت دۆڕاندنێکیتری گرەوی مێژوویی بێت.

بزووتنەوەو تێزە ((بەرەنگاری))یەلۆکالیەکان ، وەها باس لەگلۆبالیزەیشن دەکەن کە ((مەیلێکی ئەنارشیزمی، ڕاستڕەوو))[٨٧] و ((سستەمێکی بیرۆکراسی تەکنۆکراتی))یە[٨٨] . کە ئەمەش واتای ترازان و پێکدینەهاتنەوەی گلۆبالیزەیشن و دیموکراسی، گلۆبالیزمیشن و کۆمەڵگەی مەدەنیە. کەچی لە بەرامبەریدا نەك هەر بەرەو ئادەنە دیموکراسی و مەدەنیەت، بەڵکو ڕێك پێداگیریەکی نادیموکراسی و تۆتۆریتاریزمی

دەکەن!. ئەمە تەنها ڕوانگە و پێداگیری کولتوورگەرە لۆکاڵیەکان نیە، بەڵکو ئایدیۆلۆژیگەر و تەنانەت چەپەکانیش.

بەڕیارێکی چەپی وەك "سمیر أمین" باسی ئەوە ئەکات کە لەسەردەمی گلۆبالیزمیشندا ((دیموکراسیەت لە ناوەڕۆکی بەتاڵدەکرێتەوە، و دەبێتە گوتارێکی قسەیی بێمانا)). هەر دوای ئەم ڕستەیە و لە هەمان پەرەگرافدا دەڵێت ((واقیع بە بزووتنەوە دەستە جەمعیە ئاینی و ئەتنییەکان تۆڵەی خۆی، لەم دووڕوویەی نێوان قسەوکردار دەکاتەوە))[٨٩].

پێموایە ئەم تێڕوانینە لەسەرێکەوە وڕاستەوخۆ دەرکێشانی کۆمەڵگە لۆکاڵیەکان و مەعریفە لوکاڵیەکانە لە بەرپرسیارێتی داکشانی مێژووییان، لە وەزعیەتی لۆکالیزمیشانیان، لە ڕەوتگرتنی بزووتنەوە و تیزە ((بەرەنگاریەکان))ی بە ئاراستەی داکشانی کۆمەڵگە !. و گێڕانەوەی بەرپرسیارێتی یەکەمی ئەمە بۆ گلۆبالیزمیشن !. و لەسەرێکیتریشەوە شەرعیەتدانە بەو بزووتنەومو تێزانە کە وەك ((تۆڵە))یەك لە گلۆبالیزمیشن بەرێدەخرێن !. ونەمەش بە ((تۆڵەی واقیع)) پێناسە دەکات!. یان دەوترێت ((گلۆبالیزمیشن بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئسوولگەری وەك پەرچەکردارێکی سروشتیانەی وونبوون لە نێو شەپۆڵەکانی گلۆبالیزمیشندا))[٩٠] !. پێموایە ئەمە هیچی لە تێڕوانینی ئسوولگەرێکی کولتووری زیاترنیە. لە دۆزینەوەی شەرعیەت بۆ ئسوولگەرایی.

لە ئەنجامەکانەوە دەستدانە بەرەنگاری!، نەك لە بنەچەوە خۆدارشتنەوە. لە ((تحدی))وە بەرەنگاریکردن !، نەك لە بنەچەوە خۆدارشتنەوە. بەرەنگاری!، بەرەنگاری!!. ئەمەیە دروشم و تێڕوانینی تێزە سیاسیە لۆکاڵیەکان. کە بەدیوەکەیتریدا خۆپەنادانەوە بە رابردوو!، دۆڕاندنی گرەوی مێژوویی !، خۆداخستن !، خۆ قۆزاخەدانە !، نەك تێپەڕینی ئەمانە. پێموایە ئەم تێزانە لەمە زیاتریان پێنیە، و نابێت لەوە زیاتریان لێچاوەڕوانبکرێ. پرۆژە ومیتۆدی تێپەڕینی لۆکاڵیزمیی: ((مۆدێرنیتە وتەکنۆلۆژی))، لای هیچ کام لەم تێزانە نیە.

دواجار دەبێت ئەوە بڵێین وەك چۆن ((بەرمنگاری)) كۆلۆنیالیزمی وەها كەوتەوە كە ((بەرمنگاری)) مۆدێرنیتە، و تەقدیسكردنەوەی كولتوور، وئامادەكردنەوەی میسۆلۆژیانەی كولتوور، و باڵكێشانی فەزای مەعریفی میتافیزیكی بوو. ئاوەهاش ((بەرمنگاری)) گلوبالیزمیشن وەها دەكەوێتە ((بەرمنگاری)) مۆدێرنیتە و تەكنۆلۆژیاو تەقدیسكردنەوەی كولتوور وئایدیۆلۆژیا. بەئەفسانەیی و بە ئایدیۆلۆژیكردنی ژیانی كۆمەڵگە بێت. وەك چۆن گرەوی مێژوویی یەكەم دۆڕا بەهۆی ئەدۆزینەوەی بنەچەی هەڵكشانی مۆدێرنەیی خۆرئاوا. گرەوی مێژوویی ئێستاش دەدۆڕێت گەر مەعریفیانە بنەچەی هەڵكشانی گلۆبالیزمیی خۆرئاوا و داكشانی لۆكالیزمیی كۆمەڵگەكانی ئێمە نەدۆزرێتەوە.

هەن بۆ تێپەڕینی لۆكالیزمیی باسی خواستنی تەكنۆلۆژیا لەخۆرئاوا دەكەن. ئەمە هەمان تێروانینی پەنجاكان و شەستەكانە كە (( رژێمەكانی سەربەخۆیی سیاسی ))بۆ تەنمیەی ئابووری كەوتنە خواستنی تەكنۆلۆژیاو مەعریفەی تەكنیكی لە خۆرئاوا و لە سۆڤیەت . كەچی سەرەنجام گرەوی (( پیشەسازیبوونیان )) هەر دۆڕاند !!. پێموایە ئێستاش هەمان ئاكامی دەبێت. وەك چۆن بە تێڕوانینی "جابری" جیاوازییەكی ڕیشەیی لە نێوان كۆمەڵگەكانی داهێنەرو بەرهەمهێنەری مۆدێرنەو كۆمەڵگەكانی خواستنی مۆدێرنەدا هەیە ، و پێتی ئەم جیاوازییەش لەسەر مۆدێرنیتە ڕاگیردەبێت. ئاوەهاش هەمان جیاوازی لە نێوان كۆمەڵگەكانی خواستنی تەكنۆلۆژیا و كۆمەڵگەكانی داهێنەری تەكنۆلۆژیادا هەیە، پێتی ئەم جیاوازیەش لەسەر مۆدێرنیتەو لەسەر شۆڕشی زانستی / تەكنۆلۆژی ڕاگیردەبێت. لەمەوەیە كە " د. هاشم صالح " دەڵێت ، (( عەرەب تەكنۆلۆژیا "استراد" دەكات. بەلام ئەم تەكنۆلۆژیایە لە بریتی ئەوەی ببێتە فاكتەری تووندوتۆڵكردن "دمج"ی كۆمەلایەتی، بۆتە فاكتەری هەڵوەشانەوەی كۆمەڵایەتی و "بلبلەی مەعنەوی"))[91] ئەگەر تێزەلۆكالیەكانی ((بەرمنگاری)) گلۆبالیزمیشن، لەوێوە شەرعیەت وبیانوو پاساوەكانی ((بەرمنگاری))

دەهێننەوە، کەهەن هەر لەخۆرئاوا خۆیدا وەها باسی گلۆبالیزەیشن دەکەن کـە((تەڵـەی دیموکراسـی))[92] و ((شۆرشـی لوتکـە دژی قـاعدە))[93] و کۆلۆنیالیزمی ئابوری یان کۆلۆنیالزمی بازاڕە. و ((ملدان بەدەسـەڵاتی بـازار گورزدانـە لـە دیموکراسـی))[94]، وگلۆبالیزەیشـن خـەڵکێکی زۆر بـە پـەراوێزدەکات. و پەرچـەکرداری پـەراوێز بومکـانیش، پـاخیبوون، هەڵگەڕانەوە، زەبروزەنگ، ئسوولگەری، نائەقلانیەتە. و هەر ئەمەش وا لە گلۆبالیزەیشن دەکات کە ڕەوتێك بێـت بـەرەو (( هەڵتـەکاندنی هـەموو ئـەو بونیادەی کە دیموکراسی لەسـەر ڕاگیر دەبێت))[95]. بۆلێکبیهەڵوەشانەوەی شیرازەی کۆمەڵایـەتی کۆمەڵگـە و ((دارمـانی بـەهایی))[96]. بەواتایـەك ڕەوتێکە بۆ هەڵتەکاندنی بونیادی کۆمەڵگەی مەدەنی. دەڵیم ئەگەر لەم وێناکردن و تێڕوانینەوە پاساوی هەبوونیان دێننـەوە، بـەڵام گلۆبالیزەیشن تەنـها ئـەم رووەی نیـە. تەنـها ئەمـە نیـە، تـا بتوانرێـت ئەنـێشـەی بەرەنگاربوونـەوە وتێپەڕێنی ((مۆرلیی و ویژدانیانـەی)) بکرێـت!. بـەڵکو روویتریشی هەیە. گلۆبالیزەیشن رەوتێکە فرەڕوو، فرەرەهەند دەبێت وەك یەکەیـەکی ((متکـامل)) بخوێندرێتـەوە. هـەر تاکرەهـەندکردنێك و تـاکڕووکردنێکی ترازانـی تێگەیشـتنی واقیعـی و ڕاسـتەقینەیەتی. گلۆبالیزەیشـن وەك ((ئـابووری، دارایـی، بازرگـانی، تکنۆلـۆژی)) جۆرێـك راڤەکردنە. و وەك فۆرمێك لە بەها وفەرهەنگیش جۆرێکیتر لە راڤەکردن.

بەر لەکۆتایی ئـەم بەشـە، دەبێت ئـەوە بڵێـین کـە گلۆبالیزەیشـن رەوتێکە،

- لەسەر هیچ ئابوریەکی نیشتمانی خۆی راگیرناکـات. وەستانی ئـەو لەسـەر هـەموو ئابوریـە نیشـتمانیەکانی جیهانـە، بۆیەشـە وەك یەکەیەکی ئابووری جیهانی خۆی پێناسەو تەرحدەکات.
- پابـەندی بـە هیـچ دەوڵـەتێك، نیشـتمانێك، نەتەوەیـەك، کۆمەڵگەیەکەوە نیە، بۆیەشە وەك ئاراستەیەکی تێپەڕینی ئەمانە و ئاراستەیەکی جیهانیی خۆی پێناسە و تەرحدەکات.

- لەسەر ((هەیئە))تێکی ئابووری سەرووقەومی ودەوڵەتیی خۆی ڕاگەرکردووە نەك ((هەیئـە))تێکی سیاسی سەرووقەومی وسەروودەوڵەتیی بۆیەشە ئەولەویەت لە سیاسەت دەسێنێتەوە بۆ ئابووری.

- لەسەر هیچ سیستمێکی فکریی ((منسجم)) خۆی ڕاگیرناکات، بۆیەشە پابەندی خۆی ناداتە هیچ ((ئایدیۆلۆژیا، عەقیدە، مەزهەب))ێك. و ئەولەویەت لە هەموو ئەمانە دەسێنێتەوە بۆ تەکنۆلۆژیا وزانست.

گلۆبالیزەیشن خودی پرۆسەی بەرهەمهێنانی – تەنانەت کالآیەکی - لە چوارچێوەی ئابووری نیشتمانی دەرکێشاوە و دابەشی زۆرەها ئابووری نیشتمانیی کردووە. لە سەردەمی گلۆبالیزەیشندا، سەرمایە، چالاکیەکانی سەرمایە، کەڵەکەکردنی سەرمایە، ڕاگەیی و ڕەهەندێکی جیهانیی هەیە. ڕاگەیاندن، گەیاندن، پەیوەندیەکان، بازاڕی دارایی ڕایەڵبەندی ورەهەندێکی جیهانییان هەیە. لێرەوەیە کە تیئۆریسەنەکانی گلۆبالیزەیشن بنەچەی ئەو تێروانینەیان ئەدۆزنەوە کە دەڵێن: (( گلۆبالیزەیشن کاروانێکی حەتمیە. تەنها دەکرێ بە شۆڕشی پیشەسازی بەراوورد بکرێت. ئەوانەی بەرەنگاری دەبنەوە لە کۆتایدا هەر ئەدۆڕێن. وەك چۆن ئەوانە لە سەدەی نۆزدەدا دۆڕان کە دەیانویست بەرووی ئامێردا بوەستنەوە))[97].

بەواتایەك و لەدیدی ئەوانەوە بەرەنگاربوونەوەی گلۆبالیزەیشن بێئەنجامە: (( گلۆبالیزەیشن بۆ خۆی داهاتووە ولەودیوی ئەوەوە داهاتوویتر نییە))[98].

## بەشی شەشەم

((١))

لەوێوە کە کۆمەڵگە، ئابووری کۆمەڵگە، رۆشنبیری وفەزای مەعریفیی کۆمەڵگە، راوەستانی حەقیقی ومێژوویيانەی کۆمەڵگە، پرسیار ورووبەڕووبوونەوەکانی بەردەم کۆمەڵگە، لە مەخمەلیبوون ((شەفافیەت))ی تێپەڕاندووە. لەوێوە کە کۆمەڵگە، کۆمەڵگەکان بەگشتی لە حاڵەتێکی ئاڵۆزبوونی ژیان و کرانەوەدان بەرووی یەکتری و بەڕووی جیهاندا، ولەپرۆسسێکی بەردەوامی خواستنی بەهاو دامەزراوەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیین لە یەکتری. لەوێوە کە پشتەوەی حاڵەت وديارده کۆمەڵگەییەکان، پشتەوەی گرفت وکێشەو دەرگیریەکانی کۆمەڵگە فرەمەرجەع و فرەهۆکاری کۆمەڵگەیی وجیهانیە. وبەرەو یەکناراستە و تاکرەهەند نین. لەم وەرچەرخان وتێپەڕینە کۆمەڵگەییە مێژووییەوە. کارایی مەعریفیی و کۆمەڵگەیی هەموو ئەو روئیاو میتۆدە مەعریفیانە دەکەونە ژێرپرسیارەوەکە تایبەتی کۆمەڵگەی سادە وشەفافی کولتووریی ، و کۆمەڵگەی داخراوی ئایدیۆلۆژین. وهەمیشە خوێندنەوەکانیان تاکرەهەند، تاکناراستە، ستوونیە. و وێناکردن و((بابەتی)) کردنەکانیان بازنەی دووانەیی پۆزەتیفکردن و نێگەتیفکردنە. بنەچەی سەرەکی گرفتی کۆمەڵگەکانی ئێمە لێرەدایە کە تائێستاش، دەمانەوێت بەوروئیاو میتۆدە شەفافانە کۆمەڵگە، واقیعی کۆمەڵگە بخوێنینەوە کە زۆری لە شەفافیبوون تێپەڕاندووە. ئەو حەقیقەتانە بدۆزینەوە کە ڕێژەدارین و لە دەرەوەی هەر رونیایەکی یەقینگەر و موتڵەقگەر وحەتمیەتگەرەوەن . کۆچ یەکێك لەوحاڵەت و دیاردە کۆمەڵگەییانەیە کە تا ئێستاش لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا، بۆ خوێندنەوە و راڤەکردنی ئەو میتۆدو روئیایانە بەدەستەوە

دهگیرێ. هەوڵی بەزۆرسەپاندنی ئەو تیژی خوێندنەوەو ڕەفەکردنە ئەدرێت. کە تەنها بۆ کۆمەڵگە کولتووریە پێشمۆدێرنیتەکان وئەو کۆمەڵگەیانە دەستنەدات کە داخراوی توتالیتاریزمیەکی ئایدیۆلۆژین. بۆ سەردەمێك کە ئێستەی کۆمەڵگە زۆری لەوە تێپەڕاندووە.

کۆج بە عەقیدەو لە ڕونیای عەقیدەییەوە ناتوانرێت بخوێندرێتەوە . لە بەرامبەر هیچ عەقیدەیەك و لە هیچ عەقیدەیەکەوە نەهاتووە، تا بتوانرێت بە عەقیدە ڕەفەبکرێت . کۆج یەقینی پێنیە، تا لە بەرامبەر یەقینە عەقیدەییەکان دابنرێت. تا بە یەقینە عەقیدەییەکان بناخنرێتە دوانەیی یان پۆزەتیفکردنی ، یان نێگەتیفکردنی. هیچ قسەیەکی لەبارەی ئەم یان ئەو ئاین یان ئایدیۆلۆژیا تایبەتەوە نیە. کۆج دەرهاویشتەی پروسسێکە و لە واقیعێکەوە هاتووە کە وێرای ئەوەی لە ((اجتهاد))ی ئاینەکان نیە . ئەگەر ئایدیۆلۆژیایەکیش لە ڕەوتگرتن و سەرپێکەوتنیدا ڕۆڵێکی هەبووبێت. ئەوا نەك هەر پابەندی خۆی بۆ هەر ئایدیۆلۆژیا، مەزهەبێك ئاینێك ڕەتدەکاتەوە ، بەڵکو سەقامگیربوونیشی لە دەرەوەی هەموو ئەمانەیە . کۆج حاڵەتێکی ئاڵۆزی کۆمەڵگەی ئاڵۆزە. باگراوند و ڕەهەندێکی جیهانیی هەیە ، جیهانێك کە ترازانی دوانەیی ئاڵۆزی ((گلۆبالیزەیشن- لۆکالیزەیشن ))ە . جیهانێك کە لە شەڕو ململانێی نێوان ئایدیۆلۆژیاکان ، نێوان ئاینەکان ، نێوان ئاین و ئایدیۆلۆژیاوە نەهاتووە هەر بۆیەش ڕەفەکردن و تێگەیشتنی لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیاو ئاینەکانە . کۆج تایبەتێتی سەردەمێکە کە تێپەڕینی کولتوورگەرایی و ئایدیۆلۆژیگەراییە . تێپەڕینی مەعریفەو شەڕی عەقیدەکانە . کە ئەمە ئەڵێین بەواتای ئەوە نیە کە هەر شتێك ئاینیی نەبێت ، ئاین نەتوانێت تێگەیشتنی بەرامبەری هەبێت، و بیخوێنێتەوە و ڕەفەیبکات. هەر شتێك ئایدیۆلۆژی نەبێت ئایدیۆلۆژیا نەتوانێت تێگەیشتنی بەرامبەری هەبێت، و بیخوێنێتەوە و ڕەفەیبکات. یان بەکورتی شتە ناعەقیدەییەکان عەقیدە نەتوانێت بیانخوێنێتەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە خودی ئیمکانبوونی

تێگەیشتن. خوێندنەوە و راڤەکردن نیە، بەڵکو چۆنایەتی تێگەیشتن و خوێندنەوە وراڤەکردنە.

بەواتایەك مەسەلەی بنچینەیی لێرەدا روانگەی عەقیدەیی نیە بۆ کۆج. وبەرژەوەندی عەقیدەیی پشتەوەی ئەم روانگەیە نیە. بەڵکو خوێندنەوەی کۆجە. لێرەوە دەکرێت بگەرێینەوە بۆ راڤەکردنی کۆج کە میتۆدێکی دەوێت و دەبێت لە روئیایەکی مەعریفیەوە بێت کە ئەو دیووی ئاین وئایدیۆلوژیاکانە. کە نەك کۆج، پرسیارەکانی کۆج، بەڵکو توانای خوێندنەوەو راڤەکردنی هەموو ئەو روانگە عەقیدەییانەشی هەیە کە بەرامبەر کۆج ئەرحەدەبن. پرسیاری بەرامبەر ئەمانیش هەیە.

بۆ ئاسانکردنی زیاتری ئەم تێروانینە، دەڵێم ئەگەر کۆج:

- لە وولاّتێکدا هەیە کە ئاسیۆنالیستەکان لە دەسەلاّتدان، لە وولاّتێکیشدا هەیە کە لیبرالیستەکان، کۆمۆنیستەکان، ئیسلامیە – سیاسیەکان لە دەسەلاّتدان.

- لە کۆمەڵگەیەکدا هەیە کە کۆمەڵگەی ئیسلامیە، لەو کۆمەڵگەیانەشدا هەیە کە ئاینیتریان هەیە، مەسیحی، کۆنفۆشیوس، هندوسی، بوزی ... هتد.

- لەو کۆمەڵگەیانەدا هەیە کە تا ئەو پەری پابەندن بە ئاینەوە. و بە شێوەیەکی ئارتۆکسی لە ئاینەکەیان دەروانن. لەو کۆمەڵگەیانەشدا هەیە کە بێباوەری ئایینی تیایاندا لە برەودایە. و لەو کۆمەڵگەیانەشدا هەیە کە بەئاسانی ئاینەکەیان دەگۆرن.

- لە وولاّتێکدا هەیە کە مۆزایکی ئەتنیی و ئاینیە، لە وولاّتێکیشدا هەیە کە هۆمۆجینیەکی ئاینی و ئەتنییە.

- لە وولاّتێکدا هەیە کە ئیسلامیەکان لە دەسەلاّتی سیاسیدان، لە وولاّتێکیشدا هەیە کە ئیسلامی – سیاسی ئۆپۆزیسیۆنن.

- له وولاتێکدا هەیە کە ناسیونالیستەکان لە دەسەڵاتدان. لە وولاتێکیشدا هەیە کە ناسیونالیستەکان ئۆپۆزیسیۆنن. ئەمە بۆ هەموو ئایدیۆلۆژیاکانیتریش وەهایە.

- لە وولاتێکدا هەیە کە سستەمە سیاسیەکەی سەپێنەرانە ((تۆتالیتاریزمی، ئۆتۆریتاریزمی، دیکتاتۆری))یە. لە وولاتێکیشدا هەیە کە سستەمە سیاسیەکەی ((دیموکراسیە)).

- لە وولاتێکدا هەیە کە سنورەکانی تەنك و سێنترالیزمی دەسەڵاتی کاڵە – لە وولاتێکدا هەیە کەلە رووی ئابوریەوە کراوەیە، نموونەی ((مەکسیك ، تورکیا)) . و بە پرۆسسەکانی ((تایبەتیکردن)) و ((هەیکەلەکردن))، دارشتنەوەی ئابوریەکەیدا گوزەر دەکات. لە وولاتێکیشدا هەیە کە هێشتا نەچۆتەژێر مەرج و داوا و سیاسەتەکانی سستمی تەمویلی جیهانیی .

لە هەموو ئەمانەشەوە ئەوە ئەنجامیگیریی دەبێت کە : ستەمەو ناتوانرێت کۆج لە سستمێکی سیاسی دیاریکراودا ، لە سستمێکی عەقیدەیی کۆمەڵگەدا، لەکرانەوە یان نەکرانەوەی ئابوریدا کورتبکرێتەوە. بەڵام ئەوەی هەموو ئەو سستەمە سیاسی و کۆمەڵگە و وولاتانە کۆکدەکات لۆکالیزمییبوونیانە. بەبێراوەستان لەسەرتێزی لۆکالیزمیشنیان کە لەدەرەوەی ئاینیبوون و ئایدیۆلۆژیبوونێکی دیاریکراودایە. و هەموو بەشەکانی پێشووی ئەم باسە تەرخانی ناسینەوەی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانەکراوە کە کۆچی لێوە سەرپێدەکەوێت.

لە کۆج هەموو شتەکان بەرپرسیارن. کۆمەڵگە بەرپرسیارە بەهەموو تێزە لۆکالیەکانیەوە. جیهانێك، بەرپرسیارە بە هەموو حەقیقەتە دامەزراوە گلۆبالیزمیشن و لۆکالیزمیشنەکانیەوە، بە هەموو تێبەرینێکی حەقیقەتە دامەزراوە پێشووینەکان، وهاتنەوەمەیدانی ئەم حەقیقەتانە و بەرەنگاریکردنی تێنەپەرینیان. هەموو دەبێت وەڵام بە کۆج

بدەنەوە. کۆچ پرسیارە لە هەموویان. بەوتایەك ئەوەی لێرەدا پرسیاری پێیەو دەبێت پرسیار بکات. و وەڵامەوەرگرێتەوە تەنها ((کۆچ))ە.

ئێستا هیچ ئاین، ئایدیۆلۆژیا، سستمێکی سیاسی، ئابووریەك تەبەنناى کۆچ ناکەن. هیچیشیان جگە لە ڕاسیزتەکان – نیو ڕاسیزتەکان، یان گلۆباڵ ڕاسیزتەکان – دژایەتی ئاشکرایان بۆ کۆچ ڕانەگەیاندووە. وپێیەکی توونلیان لەسەر پرسی کۆچ راگیرنەکردووە. ئەمەش راستیەکی ئەو تێڕوانینمیە کە: هاتن و ڕەوتگرتنی کۆچ لە بەرامبەر پرسیارگەلێکە کە لە لۆکاڵیزەبیبوون، یان لۆکاڵیزەیکردنی کۆمەلگەیەك، لە گلۆبالیزەیبوون، یان گلۆبالیزەیکردنی جیهانێك، دەکرێت. نەك کورتکردنەوەی ئەمە لە تەنها ئەو کۆمەلگە، دەولەت، سستمە سیاسیەدا.

کە دەلێین کۆچ پرسیاری هەیە، وەلامی ئەو لای هیچکام لەعەقیدەکان نیە. لای تەنها ئەم یان ئەو کایەیەی دینامیکیەتی کۆمەلگە بەتەنها نیە. لای تەنها یەکناراستە، یەکڕەهەند، یەك دەمووچاوی سستمی گشتی کۆمەلگە وسستمی جیهان نیە. کە دەلێین پرسیارەکانی کۆچ پرسیارە لە هەموو حەقیقەتە دامەزراوەکان، لە هەموو ڕەنگە کۆمەلگەیی و جیهانیەکان. پرسیارە لە ئاین، ئایدیولوژیا، ئابوری، سیاسەت ، رۆشنبیری، کولتووری، تەکنولوژیا، زانست. دەشلێین تەنها وەلامی لە یەکێکیانەوە ناوێت. وەلامەکانی کۆچ لای کۆمەلگەیەکیش نیە بەتەنها لای هەموو کۆمەلگەکانە. لای جیهانێکە، لای شۆرش و وەرچەرخانێکە. کە هەموو پیاوەکانی مێژووی نووسراوی مرۆڤایەتی هێناوەتەوە رووکاری کۆمەلگە. رووکاری ململانێ و شەرکردنی یەکتری.

پرسیارەکانی کۆچ جەوهەرین. دەبێت لە جەوهەرەوە وەلامبدرێنەوە. بۆ کورتکردنەوەی ئەم تێڕوانینە دەلێم: کۆچ پرۆژەیەکی پرسیارئامێزەکە دەیەوێت وەلامەکان لە کۆمەلگەیەکەوە وەرگرێت. کۆمەلگەیەك کە دەیەوێت خۆدارشتنەوەی بۆچوونە شارستانیەت و مێژووی سەردەم بێت، کۆچ حەقیقەتی دۆخێکی کۆمەلگەیە، تێپەڕینشی

- خاووكردنـــەوەى رەوتگرتـــن و كاريگەريـــەكانى - بـــە پرۆژەيـــەكى كۆمەلگەيى دەبێت. پرۆژەيەك كە دەبێت كۆمەلگە بە هەموو شتەكانيدا ، بە هەموو حەقيقەتە دامەزراو پێداگيرى و قسەكانيدا، بەهەموو رونيـا مەعريفيـەكانيدا، بچێتـەوە. و سـەر لـەنوێ داياننپژێتـەوە وگوزارشـتى نوێيان لێبكات.

(( ٢ ))

كـۆچ كردەيـەكى كوێرانـە نيـە. ستەمە كـۆچ بـە نـا هوشـيارى راقـەبكرێت. بـەر لەباسـكردنى ((چيـەتى)) ئـەو هۆشـيارىەى كـە كـۆچ بەرهەمدێنێ و بۆ ئاسانيى ئەم باسكردنەش، دەبێت بڵێين:

وەك چۆن هۆشياريەك هەيە كۆچ بەرهـەمدێنێ، كۆچيش رۆڵـى لەدووبارە بەرهەمهێنانـەوەى ئـەم هوشياريەدا هەيـە. بـەو واتايـەى كـۆچ پـرۆژە وبزووتنـەوە و گوزارشـتێك نيـە بـۆ تێپـەڕينى هۆشـيارى بـاوو بالآدەستيى رۆشنبيريە لۆكاڵيزميـەكان، وەك چۆن كۆمەڵگەيـەك هەيە لە شوێنكاتێكى مێژوويـانـەيدا كۆچ بەرهـەمدێنێ، كۆچيش بەردەواميدانـە بەم شوێنكاتە. بەو واتايەى كـە كـۆچ پـرۆژەو بزووتنەوەيـەك نيـە بـۆ تێپـەڕينى ئـەم شـوێنكاتە. بـەڵكو گوزارشـتێكە، گوزارشـتێكى پڕاوپـڕى دامـەزراوى لۆكـاڵيزمى و حەقيقـەتى لۆكاڵيزميى ئـەم شـوێنكاتە. لـێرەوە دەكرێت كۆچ وەك هەر يەكێك لە پرۆژە و بزووتنەوە لۆكاڵيەكانيتر پێناسە بكەين، بـەوەى گوزارشـتن لـە دۆخـى لۆكـاليزمى، لـە داكشـانى مێژوويـى كۆمەڵگە، نەك تێپەڕينى ئەم دۆخەو هەڵكشانى كۆمەڵگە. بەواتايەكيتر، وەك چـۆن شـوێنكاتێكى مێژوويـى كۆمەڵگـەيى ، هۆشـياريەك ، كـۆچ بەرهەمدێنێت . هۆشياريەكيش ئەتوانێت رەوتگرتن و كاريگەريەكانى كۆچ

خاووبکاتەوە . ئەم هۆشیاریەی دوایش گرەوی مێژوویی کۆمەڵگەیەکە بۆ تێپەڕینی دۆخی لوکالیزمیی ((لۆکالیزەبیبوون . یان لۆکالیزمیکردنی)) .
ستەمە گەر ئەم گرەوەش لەسەر یەکێك یان چەند کایەیەکی دینامیکیەت، زیندوێتی کۆمەڵگە، لەسەر تەنها ((ئابووری یان کۆمەلأیەتی یان سیاسی یان ڕۆشنبیری یان مەعریفی یان مۆراڵی یان ویژدانی)) کورتبکرێتەوە .
چونکە ئەمە گرەوی کۆمەڵگەیەکە بەگشتیەوە . هەر وەك چۆن ستەمیشە بەرهەمهێنانی ئەم هۆشیاریە پابەندی تەنها گریمانەو تیۆرێکی مەعریفی و فەلسەفەیەك بکرێت. چونکە هیچکام لەم گریمانەو تیۆر و فەلسەفانە لە دەرەوەی شوێنکاتی مێژوویی کۆمەڵگەکان نین ، و لەو شوێنکاتەشدا نەبێت ناتوانن کارلییان هەبێت . ئەم شوێنکاتەش بە واتایەك هەم مەعریفیە و هەم مەتریالیی .
لەدوا بەشی ئەم نووسینەدا ، دەکرێ وەها قسە لەسەر کۆچ بکەین کە :
١- گوزارشتە، لە دۆخێکی قەیرانگرتووی کۆمەڵگەیی ، لە دۆخێك کە تیایدا بە هۆی :قەیران و شکستی هەموو ئەو چوارچێوە سیاسی و بناغە فکری و تیژە ئایدیۆلۆژیە باوو و دامەزراوە پێشوانەی کە ئاراسیەکیان دەبەخشیە ئایندە و تێڕوانینێکیان بەرەو ئایندە ، ئایندەی کۆمەڵگە بەرهەمدەهێنا ، با تێڕوانینێکی ئەندێشەکردووی وەهمیانەش بوبێت ، لەقەیرانی شەرعیەتی کۆمەلأیەتی و کۆمەڵگەیی سەردەمیانەی هەموو ئەو ئاراستە فکری و تەرحە ئایدیۆلۆژی ، و ئاوەند و دامەزراوە ڕۆشنبیری و سیاسیە حزبی و دەسەلأتیانەی کۆمەڵگەییەکیان بە پێوە ڕادەگرت ، لەقەیرانی هەموو ئەو ڕەنگ و سستەم و پێوانە کۆمەلأیەتیە مۆراڵی و ویژدانیانەی توندوتۆڵی و سستماتیزەیی شیرازەی کۆمەلأیەتیان دەپاراست و فەراهەمدەکرد ، لە کۆتایدا و بەکورتی بە هۆی ترازانی نێوان واقیع و ڕونیا . ئەڵێم کۆچ گوزارشتە لە دۆخێکی ئاوەها . دۆخێك کە کۆمەڵگە ڕووبەڕووی بێناسۆیی ، پەشێوی ، ئەنارشیزمی دەکاتەوە . کۆمەڵگە

رووبـەڕووی پرسـیاری فـرە و هەمـەجۆر و نوێبوونــەوەی ئـەم پرسـیارانە دەكاتەوە ، كە ناتوانێت وەڵامی قەناعەتهێنەریان پێبداتەوە .

حەقیقەتی دۆخە قەیرانگرتووەكانیش وەهایە كە پەراوێزبوونێك پــەراوێزبوونی كۆمەڵگەیـــەك ، بەشـــێكی كۆمەڵگــە -بەرهــەمدێنێ و لەمیشەوە ئـەوەی ڕواجی كۆمەڵایـەتی و سیاسـیانەی بـۆ پـەیدا دەبێـت ، ئـەوەی باڵ بەسـەر فـەزای مـەعریفی كۆمەڵگـە و ئەندێشـەی كۆمەڵگـەدا دەكێشـێ . ((پۆپۆلـیزمی)) یـە بـە هـەموو ناراسـتەكانی هەڵگەڕانــەوە و یاخیبــوون ، و خۆبەدەســتەوەدان و ئـیرادە نێگەتیڤبوونەوەكانیـــەوە . ((یۆتۆپیا)) یە بە هەموو ڕەنگە ئـسوولگەری و نووسولگەراییەكانیەوە، لـە ئەندێشــەكردنەوەی وەهمیانـــەی مێژووســـوتاندنی ڕابردووگــــەری ، و ئاییندەگەری .

لێرەوە دەكرێت ببینـە سـەر ئـەو تێگەیشـتنەی : وەك چـۆن لـە حاڵەتی ترازانی ئێستەی گلـــۆبالیزمیـــشن و لۆكاڵیزمیشنیجیــــهان ، لــــە حاڵەتـــــی ئێستەی مۆنۆپۆلـیزمیی ((گلۆبالیزمیشن))انـەی هـەموو توانـاو ناوەندەكاراو بـە دەسـەڵاتەكانی ئێسـتەی جیـهان . پـەراوێزبوون و پەراوێزكردن -لۆكاڵیزمیشنكردن -ی بەشـێكی بـەرینی جیهانی لـە بڕیـارە جیهانیـەكان ، لـە ژیـان و لـە مێژوونووسینەوەی هاوچەرخانە. وەك چـۆن لەمەوە فەرمان و كردەی گلۆباڵیانـە و پەرچـەكردەو ملنـەدانی لۆكاڵیانـەی لێدەكەوێتە وە. و بەرچەكردەیەك بۆ هەڵگەڕانەوە و دەرچوون لە مێژووی سـەردەم ، و خۆپەنادانــەوە بــە ((مقومـات))ی ڕابــردوو ســەرپێدەكەوێت، ئاوەهـاش لـە حاڵـەتی ترازانـی ئێستـەی كۆمەڵگە لۆكاڵیـەكان بـۆ خــەڵكانی ((براوە)) و ((دۆڕاو))، لە حاڵەتی ئێستەی مۆنۆپۆلیزەكردنی هـەموو توانـا و ناوەنـدەكارا و بـە دەسـەڵاتەكانی كۆمەڵگە لەلایـەن خەڵكـە ((بـراوە)) و ((سـەركەوتووەكان))ەوە، و بەپەراوێزبوون یـان بەپـەراوێزكردنی بەشـێكی بـەرینی كۆمەڵگەیـە لـەژیانی ((معـترف))ی كۆمەڵگـە . ئاوەهـاش لەمــەوە فـەرمان و كــردەی خەڵكـە ((بــراوە و ســەركەوتووەكان)) و ملنــەدان و

پەرچـەكردەی خەڵكـە ((دۆڕاو و بەپـەراوێزبوو))ەكـەی لێدەكەوێتــەوە . پەرچەكردەیەك بۆ هەڵگەڕانەوە و متمانە نەكردن بە كۆمەڵگە ، گەڕان بۆ دەرچە لە دەرەوەی كۆمەڵگە .

ئەگـەر نسـوولگەرایی و نسـوولگەری پەرچـەكردەی كۆمەڵگــە لۆكاڵیزیەكانە بەرامبەر جیهان ، و كۆچی كۆمەڵگەیە لە ژیـانی هاوچەرخ ، و لـە مێـژوو و لـە شارسـتانیەتی هاوچـەرخ . كۆچیـش پەرچـەكردەی پەراوێزبووەكانە بەرامبەر كۆمەڵگـە ، بەرامبـەر هـەموو تـێزە لۆكاڵیـەكانی ((بـــەرمنگاری)) و ((خودشوناســـیكردنەوە)) ، و هــــەموو ڕێگـــــە ((تقلید))یەكانی چارەسەر .

لە وێوە كە ناتوانرێت لەو كونجە تاریكانەی كۆمەڵگەوە ، واتایـەك بـۆ "شـوناس" "پابـەندی" "ئاســۆڕوونی" "بــەها" بدۆزرێتــەوە ، كـە پەراوێزكردووەكانی تێناخنراوە. دەكرێت وەها "پـەراوێزبوون" بناسینەوە كە : "وونبـوون" "نـامۆییبوون" "دۆڕانـدنی ئاراسـتە" "تـەكاندنی بـەها" "بێشووناسی" بوونە .

لـێرەوە دەكرێــت وەهــا پێناســەی كــۆچ بكــەین كــە پــڕۆژەی بەپـەراویزبووەكان و ئەوانەشــە كــە ترســی پــەراوێزبوونیان هەیــە ، - پـەراوێزبوون لـە ژیـانی مـادی كۆمەڵگـە ، پـەراوێزبوون لـە فانتازیـای كۆمەڵگــە – بــەرەو دۆزینـــەوەی ئاســـۆ ، ((خودشووناســـیكردنەوە)) ((خوددۆزینەوە)) و ((خودسەلماندنەوە)).

٢- كـۆچ گوزارشــتە لــە بــڕوا نــەبوون ، بێمتمانــەیی بەرامبــەر : كۆمەڵگەیـەك كە نـازانێت و نایـەوێت توانـاداری ئەوە بـە خـۆی بـدات كـە سستمی گشتیی كۆمەڵایەتیانەی هاوچەرخانە دابڕێژێتـەوە . هاوچەرخانـە خۆی شوناسیبكاتەوە ، كۆمەڵگەیـەك كـە نـازانێت و نایـەوێت توانـاداری ئەوەی هـەبێت پـەراوێزگیری لۆكاڵیزمییانـەی تێپـەڕێنی و خـەڵكانی خـۆی لەپەراوێزبوون دەربازكات ؛ بڕوانەبوون وبێمتمانەییە بەرامبەر بە كارایی ئەوڕێگەچارە لۆكاڵیانەی كە تەنها بە دەوری قەیراندا ، گرفتدا خولدەخۆن

ناتوانن ، و توانای مەعریفی ئەوەیان نیە پەی بەبنەچەی قەیران ، گرفت، بەرن تەنها ئامازە ئەدەن ، مەوعیزە ئەدەن ، گوتار دەبێژن ، ئاماری ((سلبیات))ەکان دەکەن و ((سلبیات)) دەژمێرن . و ئەندێشەکانیان بۆ گۆڕانکاری ، بۆ حەقیقەتی زەرورەتی بەرێخستنی ((بزووتنەوەی گۆڕانکاری))[99] ، بەرەو داکشانی زیاتری کۆمەڵگە ، و جارێکیتریش خەولێخستنەوەی کۆمەڵگەیە بۆ بیناگاکردنی لە مێژووی سەردەم ؛ دواجاریش دەبێت بڵێین کۆچ ئەندێشەیەکە لە بڕوانەبوون بە گۆڕینی دۆخی قەیرانگرتووی کۆمەڵگە ، و خەباتکردن بۆ ئەم گۆڕینە . بڕوانەبوونە بە هەڵکشانی کۆمەڵگە .

۲- کۆچ بزووتنەوەیەکی یاخییە ، یاخیبوون لە کۆمەڵگەیەک کە قەدەری بەرهەمهاتنەوە و نوێبوونەوەی ڕۆشنبیرییەکەی ، قەدەری فەزای مەعریفی و تیژی بالآو کارای ڕۆشنبیرییەکەی هەمیشە بەرەو یۆتۆپیایە . و بەم ئەندێشە کارا کۆمەڵایەتی و سیاسیە لۆکاڵیانەشیەوە هەر ناسۆیەکی تێپەڕینی یۆتۆپیا ، لیل و نارۆشن و ستەمدەکات ؛ یاخیبوونە لە هۆشیارییەکی کارا و بالآدەستی کۆمەڵگە کە بنەچەی ڕسکانی بەردەوامی تیژە یۆتۆپیاکان و فەراهەمکردنی زەمینەی بەکۆمەڵایەتیبوون و بەکۆمەڵگەییبوونی ئەم تیژانەیە . هۆشیارییەك کە ئەپرسیاری جەوهەری پێیە ، و ئەوەڵامی پرسیارە جدی و جەوهەرییەکانی لەلایە و پێدەدرێتەوە. هوشیارییەك کە تەنها لە ئامازەکاندا خولدەخوات . تەنها کارایی لە گەمەو بەریەککەوتنی ئامازەکاندا هەیە . ناتوانێت پەیبەنهێنییەکانی ئەو دیووی ئامازەکان ، بە بنەچەی ئامازەکان بەرێت . ناتوانێت گوزارشتی ڕاستەقینە لە شتەکان بکات . و ناوی ڕاستەقینەی شتەکان بهێنێت و بدۆزێتەوە . بە واتایەك هۆشیارییەکە بۆ تەنها ڕاڤەکردنی ئامازە بۆ کراوەکان ؛ یاخیبوونە لە کۆمەڵگەیەك کە زەمەنێکە درۆ ، درۆی زۆر گەورەی ـ یان ئەو وا هەست دەکات درۆی ـ لەگەڵ دەکات !. لە کۆمەڵگەیەك کە لە پرۆسێسکی بەردەوام تەکاندنی بەڵێنەکانیدایە ! و هەموو بەڵێنەکانی جگە لە وەهم شتێکیتر

نین !. لـه کۆمەڵگەیـەك کـە کۆمەڵگەی براوەکانـە نـەك قوربانیـدەرەکان !، کۆمەڵگەیـەك کـە گـەورەترین گەمـە و کـاراترین گەمـەکانی ((بردنـەوە و دۆڕاندنـە)) !، دواجـاریش یاخیبوونـە لەکۆمەڵگەیـەك کـە لـە هـەموو گرەوەکانیدا داواکانی بەردەوامی ((قوربانیدانە)) لێی.

٤- کـە نـەڵێین کـۆچ لـە دۆخێکـی فـەیرانگرتوویی کۆمەڵگەییـەوە سـەردەردێنێ ، و دەرهاوێشـتەی شکسـتێکە ، و دەیـەوێت نەڵتـەرناتیفی شکسـتبێت . ئـەوا ئـەم ئەڵتەرناتیفبوونـەوەی بـە شـێوەی تاکگـەری ، پۆپۆلیزمی ، ناڕێکخراوەییە . حەقیقەتی کۆچیش هەر دەبێت ئەمە بێت و وەهـابێت ، کـە ئـەڵێین کـۆچ بزووتنەوەیـەکی یاخیـە و پـڕۆژەی بەپەراوێزبووەکان و ئەوانەیە کە ترسی پـەراوێزبوونیان هەیـە ئـەوا ئەمـە بـەواتای ئەوەنیـە کـە کۆچ لـە پـەراوێزبوون دەربازیـان دەکـات . چونکـە لـەوێش پـەراوێزبوونێکیتر ئەچننـەوە . بەواتایـەکیتر دەکرێت بڵێـین بـۆ بەشێکی زۆری ئەوانەی کۆچ دەکەن، لەوەوە نیە کە کۆچ چارەسەری هەموو گرفت و ئەندێشەکانی ئـەوی پێیە. بـەڵکو لـە وێوەیـە کـە کـۆچ بـە ((تاکـە چارەسـەر دەزانێـت)) و متمانـەی بـەهیچ چارەسـەرێکی دیکـە نیـە. لای کۆچبـەر چۆنایـەتی ناکامـەکانی کـۆچ هێنـدەی ئـەوە گرنـگ نیـە کەتوانیویـەتی بـەکردەی کـۆچ گوزارشـت لـە خۆسـەلماندنەوە بەرامبـەر کۆمەڵگەیـەك بکـات، کـە فێڵـی گـەورەی لێکـردوە و درۆی گـەورەی لەگەڵدەکات، و بەپەراوێزیدەکات. بەکورتی و لەکۆتایدا دەکرێت بڵێن کۆچ ((ئاڵای سوپایەکە پاش شکست بۆ کۆ کردنەوەی ڕەگەزەکان ناڕەزایی))[١٠٠].

٥- خوێندنـەوەی کۆچ و پۆپۆلیزمی تەنها بە حەقیقەتی یۆتۆپیابوونی ڕۆشـنبیریەك و بـەراوێزبوون نـاگرێت . بـەڵکو بـە بـەرینی پانتـایی کۆمەڵایەتیانـەی پـەراوێزبوون ، و ممارەسـەی یۆتۆپیایانـەش کـە بـەهۆی بەرزی ئاستی گەشـەی دیمۆگرافی ، و بـەرزی ڕێـژەی لاوان و نزمـی ئاسـتی گەشـەی ئـابووری کۆمەڵگە لۆکاڵیـەکان، هەمیشـە پـەراوێزبوون بـەرینترو ممارەسـەی یۆتۆپیانـە توندڕەوتـر دەبێـت . ئەمەیـە حەقیقـەتی هـەموو

((کۆمەڵگە گەنجەکان )) کە یاخیبوونەکانی ڕادیکالستیانەیە بەرەوشۆڕش ، ئسوولگەری ، تیرۆر ، کۆچ ، نائارامی .

سەرچاوەکان :-


١. محمد اركون — الفكر الاسلامي قراءة علمية
٢. محمد اركون — اين هو الفكر الاسلامي المعاصر
٣. محمد عابد الجابرى — التراث و الحداثة
٤. ساموئيل هانتنكتون — صدام الحضارات ، اعادة صنع النظام العالمي
٥. فوكوياما — نهاية التاريخ و خاتم البشرية
٦. هانس — بيتر مارتين و هارالد شومان — فخ العولمة ، و الاعتداء على الديمقراطية و الرفاهية .
٧. العولمة و التحولات المجتمعية في الوطن العربي — مركز البحوث العلمية.
٨. حوار بين الدولة و الدين .
٩. مجلة النهج عدد /١٤
١٠. د. احمد بغدادي تجديد الفكر الديني — دعوة لاستخدام العقل


پەراوێز:-

*١ ئەمە بەو مانایە نییە کە دیاردەی کۆچ بەهۆی (ووتن) و جیبەتی باسکردنیەوە ، خاووبوونەوە تیایدا بەدیبێت. بەڵکو زۆرتر بۆ ناسینەوەو دروستی پێناسەکردنێکن بۆ کۆچ و کۆچبەری کە تەواوی ئەم باسە تەرخانی ئەم تێروانینەیە. خاڵێکیتر، ئەم باسە لەنیسانی ٢٠٠١دا نووسراوە، بەمەش بێگومان ئەو ووتارو نووسینە جدیانە ناگرێتەوە کە دواتر لەبارەی کۆچەوە نووسراون. بەتایبەتیش نووسینەکانی گۆڤاری (رەهەند — ژمارە ١٢و ١٣) کە بەلای منەوە پوختترین و جدیترین نووسینێکن سەبارەت بەکۆچ و کۆچبەری و رەهەندەکانی

*٢ دەکرێت کردنی ئەم پرسیارە، وەهاشبێت کە کێ لەکۆچ بەرپرسیارە، کۆمەڵگە بەهەموو پاشخانە کولتووری و

کۆمەڵایەتییەکانیـــەوە، بەهـــەموو زینـــدوو راگرتنەکانیـــەوە. بەواتایـەکیتر، ئـەوەی کـۆچ سـەرپێدەخات هـێزی باڵپێوەنـان یـان دەرپەڕاندنی کۆمەڵگەی خودە یان هێزی راکێشانی کۆمەڵگـەکانی تاراوگە، یان هەردووکیان بەرادەو بەشی جیاواز لەسەرپێکەوتن و رەوتگرتنی کۆچ بەرپرسیارن.
*٣ ئەگەر لەکۆمەڵگەی کۆچلێکـردوودا کـۆچ دەرئـەنجامێکی ئاسایی نـامۆییبوون و پـەراوێزبوون. و ناراسـتەیەکبێت بـۆ تێپـەڕینی نامۆییبوون و پەراوێزبوون. ئەوا لـە کۆمەڵگـەی کۆچبۆکـردوودا جارێکیـترو لـــەفۆرمێکیترداو بەشـــێوەیەکیتر، و لەبەرامبـــەر کۆمەڵگەیەکیتر ئەم پەراوێزبوون و نامۆییبوونە لەژیانی کۆچبەردا سـەردەردێنێتەوە. بـەڵام هـەر لـەم کۆمەڵگەیانـەدا، کۆمەڵگـەکانی تاراوگە، کۆچ لەنامۆییبوون و پەراوێزبوونێك بەرپرسیاردەکرێت، و رووبەڕوودەکرێتەوە کە نەك هەر کۆچ لێی بەرپرسیارنییە، بـەڵکو کۆچیش وەك ئەو تەرزە لەنامۆییبوون و پـەراوێزبوونی رۆڵـەکانی کۆمەڵگـــەکانی تاراوگـــە دەرهاویشـــتەی گۆڕاوییـــەکی ژیانـــە کەسەرتاسەری جیهانی گرتۆتەوە.
*٤ چونکـە هـەر ئـەم خوێندنـەوەو تێگەیشتنە، و تەنانـەت مـەیلی ئەمە، ئایدیۆلۆژیاو کولتوور ناچار بەخودخوێندنەوەیـەکیتر دەکات کـە لەوانەیـە زۆرێـك لەشـیمانەو گریمانـــەکانی خودڕاوەســـتان و خۆبەزندوویەتی مانەوەی هەڵتەکێنن.
*٥ بێگومـان مـن لـێرەدا خـۆم لەهـــەر پێناســـەیەکی فەلسـەفی و ئـایدیۆلۆژی چـەمکی ئـازادی دەبوێـرم. بـەو واتـاو گوزارشـتە سـادە کۆمەڵایەتییە باس لەئازادی دەکەم، کە لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا و لـە کولتـووری سیاسـیماندا هەیـە. بـەبێ راوەسـتان لەسـەر بنەچـەو بەشـداری ئایـدیۆلۆژیـا یـان کولتـوور لـەم هـەبوون و پێناسـەیەی ئـازادی. هـەروەك لـێرەداو لـەم باسـەدا ئـاوڕ لـەو ئیشـکالیات و

پرسیارگەلەش نادەمەوە کە خودی ئازادی ئێستەی کوردستان پێبارگاوییە.

*٦ ١٥١/١

*٧ ٣٧٨/٦

*٨ چەمکی نارکۆن ٧٨/٢

*٩ ١١٤/٧

*١٠ ١١٧/٧

*١١ ١١٤/٧

*١٢ ١١١/٧

*١٣ ١٩٩/٦

*١٤ ٢٢٩/٦

*١٥ ٢١٥/٦ ((ولیم گریدر )) لە رۆژنامەی (( واشنطن))

*١٦ ١٢١/٦ د. هانیس تیتمار — سەرۆکی بانکی مەرکەزی ئلمانیا .

*١٧ ٢٣٠/٦ د. بطرس غالی.

*١٨ بوونی دەوڵەتی بێئایدیۆلۆژیا. یان تەکاندنی ئایدیۆلۆژیا لە دەوڵەت، یان بێئایدیۆلۆژیبوونەوەی دەوڵەت بەو مانایە نییە کە دەوڵەت یان حزبی حاکم یان دەستەو دەستەبژێری فەرمانڕەوا ئیعلانی بێ ئایدیۆلۆژیبوونی خۆی بکات. ئەمە لەهیچ شوێنێکی دونیادا وەها نیە، بەتایبەتیش لەم دەستە کۆمەڵگەیەدا کە هێشتا ئایدیۆلۆژیا ئەفسوونی خۆی ماوە. و هێشتا تەنانەت تیژە تۆپۆزسیۆن و بەرەنگارییەکان بەناین و کولتووریشەوە لەئایدیۆلۆژیبوونی هەڵسوڕان و چالاکیەکانیان نەک سڵناکەنەوە، بەڵکو حزبیشی بۆ دروستدەکەن. و هێڵی ستراتیژی سیاسەتکردنیشی بۆ دەکێشن. بەڵکو بەو مانایەیە کە چیتر ئایدیۆلۆژیاکەی دەنگدانەوەیەکی جەماوەری و کۆمەڵایەتیانەی نیە، و ئەو ئەفسوونەی پێشتر هەیبوو دۆڕاندوویەتی.

*١٩      ١٧٨/٨
*٢٠      ١٣٧/١٠
*٢١      ٦١/٨

*٢٢ ئەمە ، کۆمەڵگە لۆکالیزەییە پلە ((یەك))ەکان . ئەو کۆمەڵگەیانەیە لە ((بلۆکی خۆرهەلات ))ی جاران کە گرەوی ((پیشەسازیبوون)) یان بردبۆوە بەڵام لە تێپەڕینی ئەم قۆناغە شکستیان هێنا. چونکە هەر لەم بلۆکەدا رستێك کۆمەڵگەیتر هەن ، بە تایبەتیش لە ئاسیای ئاوەڕاست کە گرەوی پیشەسازیبوونیان نەبردبۆوەو دەکرێت وەك کۆمەڵگەی لۆکالیزەیی پلە ((دوو )) شوناسیبکرێن .

*٢٣ ئەم کۆمەڵگەیانەش، ئەو کۆمەڵگەیانەن کە چەقگرتووی حاڵەتی گواستنەوەن بەرەو (( پیشەسازیبوون )) . لەمەوە ئەگەر ((فۆکۆیاما )) لە پێناسەی بۆ کۆمۆنیزم دەڵێت (( کۆمۆنیزم ئەخۆشی قۆناغی گواستنەوەیە )). ئەوا بەبۆچوونی من بۆ ئەم کۆمەڵگەیانە کۆمەڵگە لۆکالیزەییە پلە ((دوو))کان، کۆمۆنیزم و هەموو تێزە ئایدیۆلۆژییەکانیتر ((وەهمی قۆناغی گواستنەوە))ن.

*٢٤      ٥٩/٨

*٢٥ بەڕای (هانس بیتر مارتین - هارالد شوفانس)) هەنگاوی بەرەو گلۆبالیزەیشن دەگەڕێتەوە بۆ چلەکانی سەدەی ڕابردوو . ئەویش کاتێك ئەمریکا و ئوروپای خۆرئاوا گەیشتنە ((ڕێکەوتننامەی گشتی تاریفەو بازرگانی . GAT ))کە دواتر لەمەوە ((ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی WTO )) دامەزرا .. لێرەوە تا حەفتاکان دەوڵەت دەخالەتی چالاکانەی دەکردە ئابووری. بەڵام لە حەفتاکاندا بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی پترۆل دەوڵەت تووشی ((عجز))ی میزانیە هات . و نەیدەتوانی ((سعر الصرف))ی پارەکەی بپارێزێ و ڕێگە لە دابەزینی بگرێ . هەر ئەمەش وایکرد

له سالی ۱۹۸۹ له ئەمریکاو ۹۷۹ له بەریتانیا ئەوانه بێنەوه سەر حوکم که هۆشیاری ئایدیۆلۆژیانەی چارەسەری ئەم گرفتانەیان پێبوو . که بە ناوی(( نیولیبریالیزم )) ناوبانگی دەرکرد . نیۆلیبریالیزم له سەر دەستی ڕاوێژکاری ریگان ((میلتۆن فریدمان)) و ڕاوێژکاری تاتشەر ((فریدشن فۆن هایك )) وەك عەقیدەیەکی لیبریالیزمی ئەندێشەیی بۆکرا که بریتی بوو له دەسکێشانەوەی دەوڵەت له سانسۆرو دەخالەت لەسەر ئابووری و ئازادکردنی چالاکی سەرمایه .

*۲٦ ۲۹/٦

*۲۷ ٥/٦

*۲۸ ۲۷/٦ ((جون ئایزبیت )) زانای پسپۆر بۆ کاروباری ئاینده .

*۲۹ ئەمه بەو مانایه نییه که تەنها ئایدیۆلۆژیا چەپەکان سستەمی سیاسی تۆتالیتاریزمی دەرسکێنن و بەهەرمدێنن. بەڵکو ئایدیۆلۆژیا راستڕەوەکان ، راسیزتەکانیش تواناو ئامانجی بەرهەمهێنانی لەمجۆره سستەمانەیان هەیە، هەر خودی فاشیزم و نازیزم بەڵگەی ئەمەن.

*۳۰ بەو مانایەی که کۆمەڵگەکان بەپێی ئاستە جیاوازەکانی گەشەسەندنی ، و لەبنەمای بەریەککەوتنه کۆمەڵایەتییەکانیەوه، و بەهۆی یەکشوناسیبوونەوه بە شوناسەسەرەکی و لکە شوناسیەکانیەوه ، فرەروانگەو فرەجیاڕوانین و تێگەشتنه لەحەقیقەتە کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی و مێژووییەکان. و هەروەهاش فرەحەقیقەت دامەزراندنە، بەتایبەتی حەقیقەتە ئەتنیی و کولتوورییەکان که پاڵدانەوەیەکی رەسەنی میسۆلۆژیانەیه هەیە. و بەشێوەیەکی ئارتۆدۆکسانه پابەندییەکی بێپرسیارانه هەیە بۆیان. پابەندییەك که دەکرێت بەهۆی تاکلۆژیککردنێکی سەپێنەرانەوه بۆ ماوەیەك، ماوەیەکی مێژوویش،

کپوکڕبکرێن، بەڵام چڕوفرتنابن. نموونەش ئەو بووژانەوەو راسانە کولتووری و ئاینی و نەتنییەیە کە بەدوای ڕوخانی کامپی سۆسیالیزمدا جیهانی پێشتری ئەم کامپەی هەژاندو کەرتکرد. و بەرادەیەك وورووژێندرا کە جیهانی دەرەوەی ئەم کامپەشی هێنایەوە سەر خۆشوناسیکردنەوەیەکی سەرلەنوێی کولتووریی و شارستانیی و ئاینیی و نەتنیی، بەجیهانی خۆرئاواشەوە. هەموو توێژینەوەکانی "هانتنگتون" لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا (بەریەککەوتنی شارستانیەتەکان) تەرخانی ئەم بووژاندنەوەو راسان و وورووژاندنە کولتووریی و شارستانیی و ئاینیی و نەتنییەیە لە جیهاندا.

۳۱* دەوڵەتێك کە پاساوی دامەزراوەییبوونی خۆی و دامەزراوەکانی لەرێی ئایدیۆلۆژیایەکی چەپ و حزبێکی جەماوەری و داودەزگایەکی پۆلیسیی سەرکوتگەرەوە ، و هەروەها لەخۆبەرامبەرکردن و خۆدزکردنی سستەمێکەوە ، بەهەموو کۆمەڵگەو دەوڵەتەکانییەوە ، و لەخۆبەرامبەرکردن و خۆدزکردنی تەنانەت پێشینەی ئەو کۆمەڵگەیەوە دەهێنێت. ئەمە بێنەوەی هیچ پرسێك بەکۆمەڵگە بکرێ، و کۆمەڵگە هیچ ئازادییەکی عەقڵانیانە، نەك حەماسیانەی هەبێت بۆ ئەم لۆژیك و گەڵاڵەکردن وهەڵبژاردنەی رێگەچارەنووسسازییە.

۳۲* ئەمە بەهەموو ئاست و قۆناغەکانی گەیشتنەوە بە مۆدێرنیتە، هەر لەرێنسانسەوە کە پاڵدانەوەکانی بۆ کولتوورێکی پێش سەدەکانی ناوەڕاستبوو، تا دەگات بە رۆشنگەری کەتەنها مەزەندەکانی ئەقڵ و ئەقڵکاری مرۆڤی دەکردە سەرپشك. و ئەمجا خۆنیکتفاکردنەکانی مۆدێرنیتە بەخۆی، بێهیچ پاڵدانەوەیەکی پێشینەیی کولتووریی.

*٣٣ نیوەی ووتنەکانی ناو ئەم کەوانەیە بۆچوونی "فۆکۆیاما"ن لەسەر دەوڵەتەکانی کامپی سۆسیالیزمی، کە لەوسەرچاوەیەی ئاماژەی پێکراوە هاتوون.

*٣٤ کولتوور لێرەداو لەتەواوی ئەم باسەدا لەو دیدو روانگەیەوە کە کولتوورگەرەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، واتە تەنها سستمێکی رۆحی و ئاینی و مۆراڵی نیە. بەڵکو سستمێکیشە لە فەرمانڕەوایەتی کۆمەڵگەو لەسیاسەتکردن، ئەمیش بەگەڕانەوەیان بۆ تێزەجیاکانی ئیمپراتۆریای ئیسلامی، و بەبێ ئاوڕدانەوەو راوەستانێك لەسەر فرەیی و جیایی و تایبەتمەندێتی ئەم ئیمپراتۆریانە، و جێنشینبوونی هەر کامەیان لەشوێنی ئەوی پێشخۆی ، و ململانێ و شەڕکردنەکانی نێوانیان.

*٣٥ ٤١/٧

*٣٦ ٣٣/٨

*٣٧ ٢٨٣/٧ د. صلاح عدلی.

*٣٨ ئەمە هەرچەندە لەم باسەدا زۆرترو بەشێوەیەکی سەرەکی و وەك ئامانج و مەبەستێکی پشتەوەی ئەم باسە، لەسەر ئیشکالیاتەکانی کۆمەڵگە لۆکاڵیزمییەکان رادەوەستن. و هەر باس و قسەکردنێك لەسەر ئیشکالیاتەکانی کۆمەڵگە گلۆبالیزمییەکان بەشێوەیەکی راگوزەری دەبن ، و تەنها بۆ ئاسانکردنی روونکردنەوەو باسکردنی ئیشکالیاتەکانی یەکەمە.

*٣٩ دەستەواژەی ئیشکالیاتی (رەسەنێتی ـــ سەردەمێتی) دەستەواژەی "جابری"یە، بەڵام خواستنی من بۆ ئەم دەستەواژەیە ، ئەگەر بەهەمان دیدو روانگەی "جابری"یش بێت، و پەنام بۆ ئەنجامگیرییەکانی ئەویش بردبێت و ئاماژەشم بۆکردبێت، بۆخۆشم ئەنجامگیریترم لەسەرکردوون.

٤٠* پرسی یەکـەمێتی، بناغـەیی رەسـەنیبوون یـان سـەردەمیبوون، لەئێستادا بۆ کۆمەڵگە لۆکالیزەییەکان و بەتایبـەتیش بۆکۆمەڵگـە لۆکالیزمییـە پلـە دووەکـان پرسـێکە کـە تەنـها بـە مـەزەندەی ئـەم کۆمەڵگەیانـەو سـەردەمدارانی ئـەم کۆمەڵگەیانـە هەیـە. ئـەم پرسـە لەخۆرئاوا لەسەردەمی رێنسانسدا سەریهەڵدا، ئەویش بەگەڕانەوە بۆ کولتووری رۆمانی، یۆنانی بۆ بەگژاچوونەوەی کولتووری سـەدەکانی ناوەڕاست. کە کەنیسەو کەهەنووتەکان، پیـاوانی لاهوت، ئازادیـیان پێزنجیرو کۆتکردبوو. و کولتوورێك بوو لەچاو کولتووری سەدەکانی ناوەڕاسـت چ لـەڕووی فەلسـەفەو وەك بـەڕێوەبردنی کۆمەڵگـە بەرەوپێشەوەچوون و هەڵکشانبوو. بۆیە دەکرێـت ئـەم گەڕانەوەیـە، بەگەڕانەوەیـەکی پێشـکەووتوخوازانە نـاودێربکرێت. یـان رەسـەنیبوونەوەیەکە کـە سـەردەمیبوونێکی هەڵکشـانگەری بناغەرێژدەکات. هاتنی رۆشنگەری و ئەوجا مۆدێرنیتە بەدوای ئەم تافـە لەرێنسـاس بەڵگەیـەکیتری ئـەم هەڵکشـانە مەعریفیـەی کۆمەڵگەکانی خۆرئاوایە. بەڵام ئەم پرسە لەئێستای کۆمەڵگەکانی ئێمـەدا، پرسێك نییـە لـەنێوان کولتـووری سـەدەکانی ناوەڕاسـت و کولتوورێکی پێشـتر پێشـکەوتنخوازتردا، بـەڵکو پرسـێکە لـەنێوان کولتـووری سـەدەکانی ناوەڕاسـت و کولتـووری ئێستای مرۆڤایـەتی. ئەمـە لەگـەڵ بەشـداریکردنی کولتوورێکـی ئـایدیۆلۆژی دەڵەمـەو ئەمـەیوو تـەمێکراو و خۆمـاڵیکراوی کولتووریانـە. کـە لـەدوای سـەربەخۆیی سیاسـییەوە جێنشـینبووە، و ئاشـتبوونەوەیەکی ئایدیۆلۆژیـاو کولتـوورە. ئـەم کولتـوورە ئایدیۆلۆژیایـەش بـە بەشـی خۆی و بـەرادەی دەسەڵاترۆیشتنە کۆمەڵایـەتی و مەعریفیـەکانی بەشداری لەم پرسەدادەکات بەهەردوو ئاراستەی یەکانگیربوونەوەی لەگـەڵ کولتـووری بـەئایدیۆلۆژیکراوو، و لەگـەڵ کولتـووری مرۆڤایەتی سەردەم.

٤١* ٤٢/٢ —٤٣

٤٢* ٤٢/٢

٤٣* ئـەم جـۆرە تـێڕوانین و هەڵوێسـتوەرگرتنە ئـــەو یۆتۆپیایـــە دێنێتەوەیاد کە مۆدێرنیتەی ئـایدیۆلۆژی لـە کـامپی سۆسیالیزمیدا بەدەسـتەوە گـیرابوو. ئـەویش بـە سـڕینەوەو جزکردنـی هـەموو رابـــردوو پێشـــینەکانی کۆمەڵگـــە. ئـــەم وەلاموەرگرتنەوەیـــەش بەخۆســـڕینەوەو خۆپاککردنـــەوە لەهـــەموو رەگـــەزو توخمـــە پێشـوونەکانی خـود دەیـەوێت کۆمەڵگـە بێشـوناس و بێناســـنامە بهاوێتـــە فـــەزاو شـــەپۆلێکەوە کـــە نـــە ناراســـتەکانی دەزانـــێ و دەناسـێتەوە، و نەدەسەلاتیشـی بەسـەریدا هەیـە. جونکـە ئـــەم دەسەلاتە رۆچوونێکی کۆمەڵگەیی قوڵی هەیە ، و لەرێنسانسـەوە تـا ئەمرۆی کۆمەڵگەکانی گلۆبالیزمیشن لە فۆرمۆڵەکردنیدا بەشدارن.

٤٤* ٣٦/٢

٤٥* ٣٦/٢

٤٦* چـــەمکی هۆشـــیاری ئـــاوەژوو تـــا ئێســـتا بۆخـــۆم بـــەرچاوم نەکـــەوتووە، ئەمـــە هەرچـــەندە (د. محمـــد عبدالشـــفیع عیســـی) لەنووسینێکیدا بۆ شرۆڤەکردنی کۆمەڵگەکانی جیهانی سێ بـاس لـە (بینای ئاوەژوو) دەکات.

٤٧* چەمکی سەمیر ئەمین

٤٨* چەمکی ئارکۆن لە ((١ ))

٤٩* چەمکی ئارکۆن لە (( ١ ))

٥٠* ٢٩/٣ .

٥١* ١١٠/١٠

٥٢* ١١١/١٠

٥٣* ١١١/١٠

٥٤* ٢٥٢/٣

٥٥* ١٦٦/٢

٥٦* ٤١/٧

٥٧* ٤٢/٧

٥٨* ٤٢/٧

٥٩* ٥٦/١٠

٦٠* ٢٥٢/٣

٦١* ١١٤/١

٦٢* ١١/٣

٦٣* ٦٠/٣

٦٤* ٢٥٢/٣

٦٥* ٨١/١

٦٦* ١٨١/١ د.هاشم صالح

٦٧* چەمكی سەمیر ئەمین

٦٨* ٥٤/٥

٦٩* ٦٢/٥

٧٠* ٢٤/٥

٧١* ٥٦/٥

٧٢* ٩٢/٥

٧٣* ٧١/٤

٧٤* ٦٧/٤

٧٥* ٧٩/٤

٧٦* ٤٦/٤

٧٧* ١٥٩/٤

٧٨* من لێرەداو بۆ ناسانی رەوتی باسەكە دوو ووشەی "لۆكاڵ"و "لۆكاڵیزمیشن" بەجیاو بۆ مەبەستی جیابەكاردەهێنم. مەبەستیشم لێیان وەهایە كە "لۆكاڵ" یان "لۆكاڵیبوون"

خۆسەرفالکردنی تیژە لۆکاڵییەکانە لەبەرامبەر یەکتریدا. و لەبنەچەدا (نەویتر)ی هەرکامەیان لەناوخودی کۆمەڵگەدایە، و بەشێوەیەکی لۆکاڵی پێناسەدەکرێ و بیانوو پاساوەکانی بۆ دەهێنرێتەوە. بێگومان بەمەش کۆمەڵگە وەك کۆمەڵگەیەکی داخراو ئەندێشە وێنادەکرێ، کە کاری بەسەر ئەوەوە نەبێت کە جیهانی ئێستاو گلۆبالیزمیشن لەگەڵ خۆی چی هیناوەو چ گۆڕاویی و وەرچەرخانێکی مێژوویی جیهانیانەی سەرپێخستووە!. تەنانەت رەتکردنەوەی ئەوەی کە ئەم تیژانە خۆشیان بەرئەنجامی ئەم گۆڕاویی و وەرچەخانەبن. هەرچی "لۆکاڵیزمیشن"یشە بەواتای خۆشوناسی و خۆبەرامبەرکردن و خۆپێناسەکردنی لۆکاڵیانەیە لەبەرامبەر گلۆبالیزمیشن کە بۆتە (ئەویتر)ی لۆکاڵیزمیشن. جا چ ئەمە بەودیوەدابێت کە باخیبوون و بەرەنگاریی و بەرگریانەو خۆقۆزاخەگەریانەبێت، یان بەدیوی خۆبەدەستەوەدان. بەلام ئەم خۆبەرامبەرو خۆپێناسەو خۆشوناس و خۆدژکردنەی گلۆبالیزمیشن، لەگەڵ هەر پێداگیرییەکی لۆکالیزمیشنانەش لەسەری، دواجار وەها دەکەونەوە کە لۆکاڵیانەبن و بۆناو خودی کۆمەڵگە راپێچببنەوە، و پاساوێکبن بۆ بەگژاچوونەوەو شەڕکردنی تیژە لۆکاڵییەکان لەگەڵ یەکتری.

*٧٩ چەمکی نارکۆن.

*٨٠ دیارە لێرەدا کەباس لەدارشتنەوەو شەڕو ململانێی مەعریفیی دێت. بەو واتایە نییە کە مەعریفەیەکی ئەبستراکت بێ، ئەمە ئەگەرچی مەعریفەیەکی ناوەهاش لەدەرەوەی کۆمەڵگەو شوێنکاتی مێژوویی بوونی نیە. هەروەك خودی باسەکەش ئەمە رەتدەکاتەوە. بەلکو بەو واتایەیە کە کۆمەڵگە پرۆژەسازی خۆدارشتنەوەی پێدەکات.

*٨١ ٧٤/٢ هنری کۆبان

*٨٢ ٧٤/٢ د. هاشم صالح — ڕوونکردنەوەی تێروانینی ئارکۆن

*٨٣ ٧٥/٢ د. هاشم صالح -تێروانینی ئارکۆن

*٨٤ ٧٤/٢ د. هاشم صالح . ڕەنی ئارکۆن

*٨٥ ٨/٢

*٨٦ ١٤/٢ بیربۆردیۆ

*٨٧ ٢٤/٧

*٨٨ ٢٢٩/٦

*٨٩ ٣٢/٧

*٩٠ ٩٤/٩ د. حیدر ابراهیم

*٩١ ١٨٨/٢

*٩٢ ٣٦/٦

*٩٣ ٢٩٦/٦ *٩٤ ١٣٦/٦

*٩٥ ٢٨٤/٦

*٩٦ ٢٨٧/٧ د. صلاح عدلی

*٩٧ ٣٧٩/٦

*٩٨ ١١١/٧

*٩٩ ٦٢/٨

*١٠٠ ٦١/٨

لەگەڵ نەبوونی هیچ نامارێك بۆ دیاردەی كۆچ، لەبارەی كۆچ و "كۆچبەریی"یەوە، كە كارێكی زۆر زەرووریەو دەبێت ئیشی جدییانەی بۆ بكرێ.لەدەرەوەی قسەو پێدراوەكانی، نامارێكی ناوەها، كە تائێستاش نەكراون و دەبێت بكرێن. كۆچ بۆ خۆی لەوەی تێپەڕاندووە، كە حاڵەتێكی راگوزاری سەرپێكەوتنی چەند كەسێك بێت بۆ سەرفەركردنی هەندەران. وەك ئەوەی بەر لە راپەڕین بەردەوام لە كۆمەڵگەی ئێمەو كۆمەڵگەكانی دەوروپشتماندا هەبووە، كە یان سەفەركردن بووە بۆ خوێندن، یان بەرچەكردنەیەكی تەنگپێهەڵچنینی سیاسیانە بووە.

كۆچ لەدوای راپەڕینەوە زۆر لەمەی تێپەڕاندووە، كە پێویستە لەسەر هەر لایەنێك لەلایەنەكان، و هەر شێوازێك لە شێوازەكانی ئەم تێپەڕاندنە رابوەستین. و وەها قسەو گوزارشتەكانی ئەم تێپەڕاندنە بخوێنینەوە كە مەردودێكی مەعریفییانەی تێگەیشتنی تەواوەتی "كۆچ" و "كۆچبەر"ی هەبێت.

كۆچ ئێستا بەهۆی دەرینبوونەوەی پانتایی كۆمەڵایەتییانەی بەرجەستەبوونەكانی، و بەهۆی گشتگیریی كاریگەرییەكانیو كارایی ئەم كاریگەرییەی لەسەر سستمی گشتی كۆمەڵایەتی لەهەموو ئاستەكانەوە قسەی لەسەر دەكرێ و دەبێت قسەی لەسەربكرێت. هەر لەخودی كۆچبەرەوە تا دەگات بە دەسەڵات و رۆشنبیران و تاكبەتاكی كۆمەڵگەو لەیەك بەیەكی خێزانەكانیشدا. لەمەشەوە ئەوە جێگیردەبێت، و سەلماندنی ئەو بۆچوونەیە، كە كۆچ بۆتە دیاردەیەكی كۆمەڵگەییو دەبێت وەها قسەی لەسەربكرێو وەها بخوێندرێتەوەو وەها هۆكارو راگیری و ئەنجام و رەهەندەكانی راڤەبكرێ. كە دیاردەیەكی كۆمەڵگەییەو یەكێكە لەو گوتارو بزووتنەوە كۆمەڵایەتییانەی، كە ئەگەرچی سستماتیزەی تیۆری نەبووە، بەڵام واقیعییەو پراكتیزەكردنەكانی واقیعین، كە حاڵەتی ئێستەی كۆمەڵگەی ئێمەی پێدەناسرێتەوە. جا چ ئەمە بەو دیوەدا بێت، كە حاڵەتێكی خراپەو كاریگەریی خراپی بۆ سەر كۆمەڵگەی كوردستان و

ئەزمووني كوردستان هەيەو ناسينەوەو رەنگێك و دەموچاوێكي ناشيريني نێمەيە!. يان حاڵەتێكي چاكەو بە باشە بۆ سەركەوتني ئەزموونەكەمان دەشكێتەوە!!.

خەسڵەتي دياردەو حاڵەتە كۆمەڵگەييەكانيش وەهايە، كە نەك هەر ناتوانرێت بەخۆيان و لەخۆياندا راڤەبكرێت. ئەمە گەر مەبەست راڤەكردنێكي مەعريفييانە بێت و راڤەكردنێك نەبێت، كە "ناركۆن" بە "استقاله الابستمولوجيه" يان نا ئامادەيي ئەبستمولوژي، پێناسەي دەكات[1]، بەڵكو دەبێت هەر لێكۆڵينەوەو تۆژينەوەيەكي شۆڕبوونەوەي بۆ ناو كۆمەڵگە هەبێت. بەوەي: وەك چۆن كۆمەڵگەيەك هەيە لە قۆناغێك لەقۆناغەكاني گەشەسەندنيدا، لە شوێنكاتێكي مێژووييانەيدا، لەهەناوي خۆيەوە حاڵەتێكي ناوەها دەرسكێنێو بەرهەمدەهێنێ. ناوەهاش حاڵەتە كۆمەڵگەييەكان بەهۆي بەريني تەوزيفبوونە كۆمەڵايەتييەكان و كاريگەرييە گشتگيرييەكانيانەوە گەر ئەشكاتە هەڵكێشان و رەنگكردني تەواوي گشتي كۆمەڵگە، ئەوا دەبێتە يەكێك لە رەنگەسەرەكيو يەكێك لەناسينەوەو لەوانەشە شوناسەكاني ئەو كۆمەڵگەيە.

كۆمەڵگەكان بەگشتي نەك تەنيا لە وەرچەرخان و گۆڕانكارييە مەزنەكاندا بەڵكو لەناستەكاني يەك سياقي مێژووييانەشيدا لە پرۆسێكي بەردەوام خۆدارشتنەوەدايە، ئەم خۆدارشتنەوەيەش تايبەتي ئەم يان ئەو كايەيە لە ديناميكيەتي كۆمەڵگە- لەسستمي گشتي كۆمەڵايەتي- نيە. هەر چەندە كايە جياوازەكان لەگەڵ هەموو پەيوەنديو كارلێككردنەكانيان، سەربەخۆييەكي رێژەييانەيان لەم پرۆسيسي خۆ دارشتنەوەدا هەيەو بەناستي جياوازدا گوزەردەكەن "ئاستي واهەيە تەواوي سەربەخۆيي لە دەست دەدەن و ئاستيواش هەيە تيايدا ئەوپەڕي كاراو كاريگەر دەبن"[2] بەڵام بەبێ راوەستان لەسەر ئەم هەموو تايبەتمەندێتيو جياوازيانەي ناو گشتێك، كەخودي كۆمەڵگەيە. دەكرێ وەها قسە لەسەر ئەم پرۆسەيە بكەين و هەميشەش وەهايە، كە ئاراستەكاني بەرەوتێپەڕيني دەفگرتوويي

رەنگێـك يـان .چـەند رەنگێـ!.. و تێبـەڕینی چـەفکرتوویی دۆخێکـە، بـا دەسەلاّتی سیاسی، سستمی باوی مۆرالْ و سستمی بـاوی نـەریت، میتۆدێکی ئەبسـتمۆلۆژی، فەلسـەفەیەك. ئایدیۆلۆژیایـەك، حزبێـك، بەهـەمەموو هەژمونگەریەکانیشیەوە، ئەمە ئەم دەفکرتوویی‌و چەفکرتوویـە بخوازێت. بەواتایـەکی دی گوزارشـتکردنی زیندووێـتی کۆمەلگـە لەوەدایـە، کـە لەپرۆسـسـێکی بـەردەوامی کالْبوونـەوەو کالکردنـەوەو، تۆخبوونـەوەو تۆخکردنەوەی رەنگەکاندایە. لەپروسسێکی ئاوەهاشدا زۆر حالەتی جێگـیرو باوو دامەزراو دەلـەقێ و لەوانەشـە هەلتـەکێو زۆر حالەتی نوێی وەهـاش بەرهەم دێت و زەقدەبێتـەوە، کە لەوانەیـە هـەر خـودی ئـەو کۆمەلگەیـە پێشتر رەتیکردبێتەوە. و وەها وێنـایکردبێ، کە بەشێك و جۆرێکبێت لـەو ئەندێشانەی مەحالە بەرجەستەی کۆمەلگەبێت و کۆمەلگە تەبـەنئایبکات. ئەمـە ج جای بەرهەمهێنانیشـی‌و چوارچێـوە گرتنیشـی وەك یـەکێك لـە ناسینەوە، یەکێك لە شوناس، لەدەموچاوەکانی کۆمەلگە. وەك ئیستەی کۆچ لەکۆمەلگەی کوردستاندا. لێرەوە، دەبێت وەها قسە لەسەر کۆچ بکەین کە:

۱. تـەنیا ئـەوە نیـە، کـە کەسـانێك هـەن — کەسـانێکی زۆریـش ، کـە بـەنێرە، نـێرەی کوردسـتان رازینـین و جێبـدەهێلـن و رووەدەکەنـە ئـەویَ، ئەوێی خۆرئاوا، بەلکو لە پشتەوەی ئەم کردە تاکتـاك و سادەو ئـەم بڕیـارە زۆرجار راگوزەری و بە پەلەیەی "کۆچکـردن" کردەیـەکی گـەورەتر هەیـە. پرۆژەسازیەکی نـوێ هەیـە — بـا نەنووسـراو و نـەگوتراویش بێـت — کـە پراکتیکیانە، بەشێوەیەکی جیا لە ئێمـە، جیـا لەشـێوازو لەوانەشـە جیـا لـە "مفردات"ەکانی ئێمە "ئێرە"و "ئەوێ" دەخوێنێتەوە. هەر بۆیەش لەگەلْ ئەو هەموو تێرامانـەمان لـە دیـاردەی کـۆچ، لەگـەلْ ئـەو هـەموو قسانەمان لەبارەی کـۆچ. کـۆچ هـەر بەردەوامـەو ئـەمانتوانیووە پـەی بـەو ئهێنییـە ببەین، کە لەپشتەوەی کـۆچ و بـەردەوامی کۆچەوەیـە. ئـەمانتوانیووە لـەو وشـەو رستانە بگـەین کۆجبـەر بینـەوەی بیئـالۆت "ئـێرە"و "ئـەوێ"ی پێدەخوێنێتەوەو پێناس دەکا.

نێرە، نێرەی کوردستان!، نێرەی نیشتمان!، نێرەی دەسەڵاتی کوردی و کوردستانی!، نێرەی ئەزموونی مێژوویی!، نێرەی راپەڕین و ئازادی و دیموکراسی و ئاوەدانکردنەوە!، نێرەی دوای ژینۆسایدی ئەنفال و کیمیایی!، نێرەی خێزان و سۆزی خێزان.

ئەوێ: ئەوێی خۆرئاوا!، ئەوێی نیشتمان و دەسەڵاتی خەڵکیتر!، ئەوێی هات و نەهات!، ئەوێی دیارو نادیار!، ئەوێی غوربەت و نامۆیی و پەناهەندەیی!، ئەوێی "رۆس پیرۆ" و "جۆرج هایدەر"و "ئەمبرتۆ بووسی" و "مان ماری"، و ڕێکخراوەکانی میلیتەیس و "شیت"[٣]!، دواجار ئەوێی راسیزم و قۆناغی بەرەو، فاشیزم !!.

٢-کۆچ تەنیا ئەو حەکایەتانە نیە، کە لەپشتەوەی هەر کۆچبەرێکەوەیە. هەر لە مەیل و کەڵکەڵەی کۆچ تاقەناعەت و بڕیاری کۆچ و بوونە کۆچبەر.

بەڵکو لەپشتەوەی ئەم حەکایەتە بچووکبچووک و تاڕادەیەکیش لێکدابڕاوانە. حەکایەتێکی گەورەتر هەیە، کە کۆمەڵگەیەک بە گشتییەوە- کۆمەڵگەی کوردستان- لەدارشتن و چنین و ریلڕێژیەکانیدا، لەرەگەزو پێکهاتە واقیعی و فانتازیەکانیدا، بەشدارەو لە پشتی ئەم حەکایەتە گەورەیەشەوە، حەکایەتێکی گەورەتر هەیە. حەکایەتی جیهانێك، کە بەوەرچەرخان و گۆڕاویەکی مەزندا گوزەر دەکات. وەرچەرخانێك کە بەکۆتاییهاتن و شکستی هەژمونگەری جیهانیانەی ئایدیولۆژیا وەرەوتگرتنی گلۆبالیزمیشن، تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی و شێوازەکانی بەڕێوەچوون و بەرێکخستنی ئەم ژیانە، و چۆنایەتییەکانی راگیربوون و گوزارشت لێکردنەکانی ئەم ژیانەی لەبەردەم گۆڕاویەك و زەرورەتی دارشتنەوەیەکی نوێ داناوە. هەر لەسستمی نێودەوڵەتی و جیهانییەوە تا دەگات بەسستمی گشتی کۆمەڵگەکان.

هەر ئەم روانینە لەکۆچ وەك حاڵەت و دیاردەیەکی کۆمەڵگەیی و جیهانیی وەك دەرهاوێشتەی وەرچەرخان و گۆڕانێکی جیهانی، و ئامادەیی

کۆج لەمێژووی ئێستای جیهاندا بەرهەمەندێکی جیهانییەوە. لەبەردەم گرفتێکی گەورەی میتۆدو روونیای خوێندنەوەی "کۆج"مان دادەنێت و دەبێت زۆر بەجدی هەڵوێستەی لەئاستدا بکەین. ئایا بۆ ئەم خوێندنەوەیە دەبێت پشت بدەینە کام میتۆدە مەعریفیی و لەکامە روئیاوە بێت؟ ئایا ئەمە لەتوانای ئەو میتۆدو روئیایانەدایە، کە تائێستا لەکۆمەڵگەکانی ئێمەدا باوەو ئیشی پێدەکەین و شتەکانی پێراڤەدەکەین و دەخوێنینەوە؟ یان لەدەرەوەی ئەمانیە؟ گەر ئەمەی دواییە. راگیریە ئەبستمۆلۆژیەکانی ئەم میتۆدە چیەو میکانیزمەکانی ئیشکردن و روئیاکانی چین؟. وەڵامی ئەم پرسیارانە بۆ ئەو بەرێزانە جێدەهێڵم، کە مەبەستیانە وەها کۆج بخوێننەوە، کە هەم کۆچبەر لەئێمە بگات و هەم ئێمەش لەو بگەین. بەواتایەك ئەو دیالۆگە بدۆزرێتەوە، کە لەنێوان کۆچبەرو ئێمەدایە.. من بۆخۆم ئێستە سەرقاڵی کارێکی ئاوەهام..

پەراوێزەکان:-

١-محمد ارکون — این هو الفکر الاسلامي المعاصر.

٢- برهان غلیون - حوار بین الدولة والدین- ص ٤٧.

٣-ئەمانە ئەو راسیزیستە خۆرئاواییانەن کە لە وڵاتەکانی ئەورووپاو ئەمەریکادا، دەچنە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی و لەوێوە پروپاگندەی بنچینەیی هەڵبژاردن دەکەن، کە دژی کۆج و کۆچبەرن.

میلیتەیس ئەو توندڕەوانەن، کە تەقینەوە ئەنجامدەدەن.

- "شیت" ئەوانەن داوای ویلایەتێکی سەربەخۆدەکەن.

٤-"ئێمە ئێستە لەو هەلومەرجەدا تێپەڕدەبین، کە لەپێش قۆناغی فاشیزم"موعیە ولیم گریدەر لە رۆژنامەی واشنتۆن – لەکتێبی (فخ العولمه ص ٣١٥) هانس پیتر مارتین هارالد شومان.

تێبینی: لە گۆڤاری گوڵان ژمارە "٢٣٠" بڵاوبۆتەوە.

## پاشکۆی دووەم

### چەند تێبینییەک لەسەر راپۆرتی لیژنەی کاتی تایبەت بە دیاردەی کۆچ

پێموایـه، بـەبێ ئاوڕدانـەوە و بـەبێ باسـکردن و تێگەیشـتن لـە:
بنەچـەو رەهـەندەکان، لەدامـەزراوی و جێکـەوتوویی راسـتەقینەی ئـەو
وەرچـەرخان و گۆڕانکارییـە گـەورە جیهانییـەی ، کـە شکسـت و کۆتـایی
بەهەژموونگـەریی جیهانییانـەی ئایدیۆلۆژیا هێنـا. و هاوشـان و هاوکـاتی
ئەمـەش دیـاردەو پرۆسـەیەکی بـەناوی گلۆبالیزەیشـنەوە رەوتێکی ـداو
بەرێخست، لەترازانی جیهان بۆ دووانـەیی " گلۆبالیزەیشن- لۆکالیزەیشن"،
لـەدوو تـێزیکردنێکی مێژوویی و کۆمەڵگەیی و مـەعریفیی کۆمەڵگـەکانی
جیـهان بـۆ کۆمەڵگـە گلۆبـالیزمیی و کۆمەڵگـە لۆکالیزمییـەکان، کـە دوو
ئاراسـتەی پێچەوانـەمن لـە هەڵکشـان، یـان داکشـانی مێژوویـی و
مێژوونووسینەوە، لە رایەڵبـەندیی و پەیوەندی و بەیەککەوتنـەکانی ئـەم
دوو دەسته کۆمەڵگەیەو پێناسـەکردن و شوناسیکردنەوەی هـەر کامـەیان
لەدیدگای خود و دیدگای بەرامبەرەوە: لە گلۆبالیزەیشن، کە رەوتێکە بۆ
بەیـەککردنی جیـهان لـەرووی ئـابووری و دارایـی و بازرگانییـەوە، بـۆ
رایەڵبەندکردن و بچووککردنەوەی جیهان لەبەرامبەر هۆیـەکانی گـەیاندن و
راگـەیاندن و زانیارییـەکان و لەمانەشـەوە بـۆ تـەنککردنی سـنوورەکان و
کاڵکردنەوەی سینتراڵیزمی دەسەڵاتە پێشگلۆبالیزەیشن و پێشمۆدێرنیتەکان
و بڕین و بێبایەخکردنی زۆرێـك لـە واتـاو ئەندێشـەکانی ئـەم سـنوورو
دەسەڵاتانە، لە لۆکالیزەیشن، کە شوناسـێکی پڕاوپڕی ئـەو کۆمەڵگەیانەیە،
کە گرەوی چوونە مێژووی سـەردەم و دەستپێشخەریی مێژوونووسینەوەی
سەردەمیانەیان دۆڕاندووە، لەمەشەوە لەم داکشان و دۆڕاندنەوەوە دەرگیری
قـەیرانێك، قـەیرانێکی قووڵی مێژووییبـوون. و وەك گوزارشتێکیش- نـەك
تێپەڕاندن- لەم قەیرانە کەوتوونەتەوە بەرێخستنەوەی دەورانێکی نوێ لە
بەسیاسیکردنەوەو بەکولتووریکردنەوەو بەئایدیۆلۆژیکردنـەوەی کۆمەڵگە.
بەواتایـەك دەورانێکـی نـوێ لەهاتنـەوە مـەیدانی کولتوورگـەرایی
ئایدیۆلۆژیگەرایـیـەکی رەقـەن و سەرسـەختی "تـەقدیس" کـراو و

میسۆلۆژیکراو، وەك بناغەیەك بۆ بەرێخستنەوەی شەڕی کولتوورەکان، ئەتنییەکان، ئایدیۆلۆژیاکان، ئاینییەکان لەگەڵ یەکدی و لەناویەکتردا.

شەڕێك کە دەکرێ تەنیا بە "میتافیزیکییەت" و "مۆدێرنیتەی ئایدیۆلۆژیانە" پاساوبدرێت و بیانووەکانی بۆ بدۆزرێتەوە. شەڕێك کە ئاراستەو بردنەوەو یەکلابوونەوەکانی تەنیاو تەنیا بەرەو دامەزراندنەوەی سیستەمە ئۆتۆریتاریزمی "استبدادی" و تۆتالیتاریزمی و دیکتاتۆرییەکانە؛ بەبێتێگەیشتن لەبنەچەو راگیرییەکانی ئەو "هۆشیارییە ئاوەژوو"ە و میسۆلۆژیا و یۆتۆپیایە، کە کۆنترۆڵ و مۆنۆپۆلیزەی بەشی گرنگ و سەرەکیو کاریگەری رۆشنبیرییە لۆکالیزەییەکانی کردووەو هەمیشە ئاراستەکانی بەرەو بەردەوامێتی ئیشکالییەتی دووانەیی "رەسەنیبوون – سەردەمیبوون"ە. لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمەوە بۆ سەردەمی گلۆبالیزەیشن، و لەمیشەوە رەوتگرتنی تێزەلۆکالییەکانی "بەرەنگاریکردن" و "خودشوناسیکردنەوە". لەبەرامبەر گلۆبالیزەیشن و لەبەرامبەر یەکدی؛ بەبێناوردانەوەو تێگەیشتن لە بنەچەی هاتنەوەمەیدانی پیاوەکانی دوێنێ و دوێنێی زۆر دووری کۆمەڵگە بۆ ململانێی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەییەکان، دوجاریش بەبێباسکردن و تێگەیشتن لە دووتێزیبوونێکی کۆمەڵگە لۆکالیزەییەکان.. دووتێزیبوونێکی دووراندنی گرەوی مێژوویی و داکشانی مێژوویی. دووتێزیبوونێکی گوزارشت لەقەیران، "خودشووناسیکردنەوە" لەبەرامبەر گلۆبالیزەیشن، کە لەتێزی دەستە کۆمەڵگەییەکانی "بەکولتووریکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا" و لەوی دیکە "بەئایدیۆلۆژیکردنی کولتوور"، بەبێ شوناسیکردن و خانەبەندیکردنی کۆمەڵگەی کوردستان، کە هەر دەبێت تێزەلۆکالیزەیشنی دووەم بێت. واتە "بەئایدیۆلۆژیکردنەوەی کولتوور" و خەسڵەتی ئەم کۆمەڵگەیانەش لەو ئەندێشەکردنە وەهمییانەیدایە بۆ یەکەوەهەڵکردن و پێکەوەسازانی دووانەییە ناکۆکەکانی وەك "عەلمانییەت و ئایین!"،

"میسۆلۆژیاو مۆدێرنە" ، "ر هنێتی کولتووریانەو سەردەمێتی ئایدیۆلۆژیانە"!.

لەو ئەندێشەکردنی وەهمیانەشیدا بۆ نیمکانی "مۆدێرنەبوون بەبێ مۆدێرنیتەبوون"!. "پیشەسازیبوون بەبێنەقڵانییەت"!، "ئایدیۆلۆژیبوون بەبێ عەلمانییەت"!. کە ئاکامەکانی هەردەبێت وونبوون و نامۆبوون بێت، وونبوون لەفەزایەکدا، کەشەپۆلگری میسۆلۆژیاو تەکنەلۆژیایە. نامۆبوون بەرامبەر نێستەی کۆمەڵگەو کەشی سەردەم. بەرامبەر بنەچەی مەعریفی و کۆمەڵگەیانەی فیکری خۆرئاواو کولتوور. بنەچەی هەڵکشانی گلۆبالیزمی - تەکنەلۆژیی خۆرئاواو داکشانی لۆکالیزمی - میسۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیی کۆمەڵگەی خود.

دەڵێم بەبێ ئاوڕدانەوەو باسکردن و تێگەیشتنی هەموو ئەمانە. بەبێ چەمکەکانی "نامۆبوون" و "وونبوون" ، "پەراوێزبوون" و "خۆناسینەوە" ستەمە، زۆریش ستەمە گەر ئەندێشەی ئەوە هەبێت تیرۆانینێکی زانستی و واقیعیانە ۆ دیاردەی کۆچ فۆرمۆڵە بکرێت. لەمیش ستەمتر کورتکردنەوەی پشەوەیی و راگیرو رەهەندەکانی کۆچە لەتەنیا کۆمەڵگەیەکدا، وەك فەزایەکی پریمیتیف و داخراو. ئەمە چ جای کورتکردنەوەو بچووککردنەوەی زیاتری دیاردەی کۆچ لەئەزموونێکی سیاسی و ئیداریی ماوەیەکی کەم، زۆرکەمی مێژووی کۆمەڵگەیەك!، وەك ئەزموونی نێستای کوردستان. کەئەو "کۆنووس"ەی "لیژنەی کاتی" پەرلەمانی کوردستانی پێنووسراوەتەوە!. نووسینەوەیەك کە خۆی بارگاوینەکردووە، بەراگوزەرترین ئاوڕدانەوەو کورتترین پێناسەی نێستەی جیهان و کۆمەڵگەی کوردستان لەبەرامبەر گلۆبالیزمیشن. لەسەر حەقیقەتی لۆکالیزمیی کۆمەڵگەی کوردستان بەو هەموو خەسڵەتانەی باسکران.

بەر لەهەڵسەنگاندنی ئەم کۆنووسەو راوەستان لەسەر "تەومرەکان" و خالبەندیی، هەندێ خالبەندی ، تەومرەکان ، کەوەك هاوولاتییەکی

کوردستانی ئەوە بەماف و ئەرکی خۆم دەزانم -. بەپێویستی دەزانم گەر بەشێوەیەکی ناماژەگەری و راگوزەریش بێت، ئاوڕ لەڕاستییەك بدەمەوە، کەجۆرێك لەشوناسیکردنی پیاوانی سیاسەتە بەبێگەڕانەوە بۆ ئەوەی چ ئایدیۆلۆژیایەك لەپشتەوەیەتی. جیاوازیەك، کە بڕیارێك لەسیاسیەك، یان لەپیاوانی سیاسەت جیادەکاتەوە، سادەترین گوزارشتدا لەو میتۆدی نیشکردن و تێڕوانینەیاندایە، کە هەر یەکەیان بۆ خوێندنەوەو راڤەکردن و تێگەیشتی واقیع. بۆ ناسینەوەو پێناسەکردنی دیاردەکان، گرفتەکان، بۆ نووسینەوەی مێژوویەك و ئەزموونێك هەیانە. ئەگەر بڕیارێك لەمەدا، لەم ئیشەیدا تێڕوانینەکانی لەسەر میتۆدێك رادەگرێت، کە مەعریفییە، میتۆدی "بابەتێتی - موجوعیە" و "مەعقولیەت"ە و سەرقاڵیبوونەکانی بۆ دۆزینەوەی راستییەکان، دۆزینەوەی بنەچەیی مێژوویی و مەعریفی و کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەییەکانی دیاردەکانە. و لەمیشەوە تێڕوانینێك، تێڕوانینێکی مەعریفی بۆ ئەو دیاردە، گرفتە، واقیعە گەڵاڵەدەکات. ئەوا سیاسیەك هەمیشە لەئیشکردنەکانیدا، دووئەمیەکی "بەرژەوەندی - دژەبەرژەوەندی"، "لایەنگریی - دژەوەستان"، "پۆزەتیفبوون - نێگەتیڤبوون" هەیەو تێڕوانینەکانی هەمیشە "هەڵوێستە"یە. کەبەڕای من ئەمجۆرە ئیشکردن و تێڕوانینە بۆ هەر شتێك و هەر سەردەمێك شیاوبێت، لەبەرامبەر دیاردەی کۆچ نەشیاوە، ئەمیش لەبەرهۆیەکی زۆر سادەو رۆشن، چونکە کۆچ تایبەتی تەنیا کۆمەڵگەی کوردستان "ئەزموونی کوردستان" نییە، بەڵکو گشتییەکی هەموو کۆمەڵگە لۆکالیزمیەکانە، چونکە کۆچ لەهیچ عەقیدەیەك و لەبەرامبەر هیچ عەقیدەیەك، لەهیچ تێڕوانینێکی سیاسی و لەبەرامبەر هیچ تێڕوانینێکی سیاسیدا نەهاتووە. و ناتوانرێت پێکرتن و رەوتگرتنی کۆچ لەم یان لەو تیزی سیستەمە سیاسیەدا، لەم یان لەو عەقیدە ئاینییەی کۆمەڵگەداو لەدەسەڵاتی سیاسیدابوون و ئۆپۆزسیۆنبوونی ئەم یان ئەو رەوتە سیاسیە کولتووری و ئاینی و ئایدیۆلۆژیەدا، کورتبکرێتەوە.

تاکـه تایبـەتیکردنێکی کـۆچ ڕەوتگرتنێـتی لـە کۆمەڵگـە لۆکالیزمییەکانـەوە بـەرەو کۆمەڵگـە گلۆبالیزمییـەکان. لێرەوەیـە کـە پێداگیریی لـەوە دەکـەم: بـۆ هەڵسـەنگاندن و تـاووتوێکردنی دیاردەی کۆچ، پێویستیمان بە "بیرپار"ە نەك "سیاسی".

دواجار دەبێت بڵێم، ئەمە واتـای ئـەوە نیـە، کە هەر کۆمەڵگەیـەك بەجیا نەتوانێت و مافی ئـەوەی نـەبێت، کـە دیاردەی کۆچکـردن لـەخۆیدا، لەکۆمەڵگـەدا، ڕەتـەبکات و بەشـوێن هۆکارەکانییـەوە بێـت و هـەوڵی خۆدارشتنەوەیەك بدات بۆ بەرگرتن، یان دروستتر خاوگردنـەوەی دیاردەی کۆچ، بـەڵام ئـەو توانینـە لەوێوەیـە، کـە هـەموو پشتەوەییە کۆمەڵگـەیی و جیهانییـەکانی کـۆچ ببینێ، نـەك کر ::کردنـەوەی کـۆچ و بچووککردنـەوەی ئـــارادەی تایبـــەتیکردن و پریمیتیڤکردنـــــی لەتـــــەنیا هۆکـــــارە "خـود"یـەکاندابێت. لـەمیش سـتەمتر لـەقاڵبدانی کـۆچ لـەتێڕوانینێکی سیاسـیانەداو بەسیاسـیکردنی ئـەم دیاردەیـەوە بەهـەردوو دیـوی نێگەتیڤکردنی یـان پۆزەتیڤکردنـی، کـە بەداخـەوە، دەڵێـم بەداخـەوە، ئـەم "کۆنـووس"ی "لیژنـەی کـاتی" بـەڕێزی پەرلـەمانی کوردسـتانی، پـێ نووسراوەتەوە.

بەشی دووەم

من لەم "کۆنووس"ەدا:

١-نووسـینەوەیەکی سیاسـیانە دەبینـم. سیاسـیانەیەکی زۆرسـادەو لۆکاڵییانە کـە لەپشتەوەی بـەرژەوەندی و ئامانجێکی سیاسی لۆکاڵییانـە – نـەك لۆکاڵیزمیشـانە هەیـە. هەمیشـەش تێڕوانینـە سیاسیە لۆکاڵییـەکان وەهان، کـە تـێزێکن لـە "بڵندگ ..ی" خـود، یـان خودپێناسـەکردنێکی "بێخەوش وکـەموکوڕی"و ئاراسـتەکانی بـەرەو ئەوەیـە، کـە بەرپرسـیارێتی سیاسـیانەی گرفـت و کێشـەکان لەخۆدەتـەکێنێ و شـانی دەرەوەی خـۆی پێقورسـدەکات. "کەئەمــە بەتــەواوی لەتــەوەری یەکــەمدا، هۆکــارە سیاسیەکاندا، نووسراوەتەوە".

٣-سەرەڕای کەموکوڕیی لەهەمموو تەوەرەکاندا، تێکەڵییەکیش لەتەوەرەکانیشدا دەبینم کە هەرنووکە قەڵەمێك لەبارەی "کۆچ"ەوە ووترابێت یان نووسرابێت، ئاخنراوەتە ناوی، بێووردبوونەوەو دیراسەتی تەواوەتی چۆنایەتی تەوەربەندیکردنیان.

٣-نووسینەوەیەکی "تەوفیقی" دەبینم، بۆ جێکردنەوەو نووسینەوەو پێکەوەهەڵکردنی تێڕوانینەکانی "ناوەند – معتدل" لەگەڵ تێڕوانینەکانی ئەوسەری راست و کەمێکیش داشکانەوە بەلای چەپدا. بەواتایەك نووسینەوەیەکی "ئیئتلاف سیاسییانە!"یە، وەك نووسینەوەی تەواوی رێکخراوو رەگەزەکانی بەمەدەنیکردنی کۆمەڵگەی کوردستان!.

٤-نیگەتیڤکردنێکی ئیرادەی سیاسییانەی کوردستان، دەبینم، کە دەسەڵاتی بەسەر چارەنووسی سیاسییانەی خۆی و ئەزموونەکەیدا نییە!!. "تەواوی هۆکارە سیاسییەکان".

٥-پێناسەکردنێکی وەهای کۆچ دەبینم، مەگەر تەنیا لەئەندێشەیەکی سیاسی لۆکاڵییانەدا جێی بۆ بکرێتەوە.

أ-باسکردنی کۆچ بە "پیلان"! وەك تێزێکی تێڕوانینی کولتووری رۆژهەڵاتیی لۆکاڵییانە! "خاڵی شەشەم، هۆکارە سیاسییەکان".

ب-باسکردنی کۆچ وەك جۆرێك لەنەخۆشی: هۆکانی تووشبوونی، نیشانەکانی چارەسەر، "عیلاج"ەکانی!. ئەمە لە بریتی باسکردنی بنەچەی مەعریفی و کۆمەڵگەیی و مێژوویی و راگیرییە جیهانیەکانی و کاریگەریی و رەهەندەکانی.

ج-تێڕوانین و پێناسەکردنی کۆچ وەك هەڵگەڕانەوەیەك لە پابەندییە نیشتمانی و نەتەوەییەکان. لە "بەها" و "ئاکارە" رەسەن و پیرۆزەکانی کۆمەڵگەی کوردستان "تەواوی هۆکارە رۆشنبیرییەکان".

لەتەوەری ژماردنی هۆکارە سیاسییەکاندا، "٩" هۆکار ریزکراوە، بەلای منەوە هەمموو ئەو هۆکارانە راستن و هەن، بەڵام لەپاڵ ئەمانیشدا هۆکاری دیکەی سیاسی هەن. بەر لەوەی هەر هۆکارێکی سیاسی دیکە

باسبکەین. دەڵێم لەم "٩"هۆکارە سیاسییە تەنیا یەك هۆکار - ئەستۆگیری سیاسی کوردستانیی کراوە، کەئەویش هۆکاری ژمارە"٧"ە. "شەڕی ناوخۆو.."و گەر لەم هۆکارەشدا دەستێومردانە دەرەکییەکان باسبکرێن و بەهەند هەڵبگیرێن، ئەوە بەرپرسیارێتی "سیاسەتی کوردستانیی"، یان بەرپرسیاری سیاسیانەی کوردستان لەم هۆکارەشدا کەمترو شانسووکتر دەبێت. بەواتایەك نووسینەوەی ئەم هۆکارانە لە دیدگایەکەوەیە کە:

١.وەها وێنای "سیاسەتی کوردستانیی" دەکات، کە بەدەر لەهەر کەموکوڕیی، کەمتەرخەمیی، ناکاراییەکە. وێناکردنێك، کە دەبێتە پاساودانەوە بۆ درێژەپێدانی ئەم "سیاسەتە" وەك ئەوەی هەیە، بێهیچ پرسیارو گومان و رەخنەو پیاچوونەوەو هەڵوێستەیەك لەناستیدا. پێموایە ئەم تێڕوانین و وێناکردنە "ئیدیال" گەرییە، جگە لەوەی ئەندێشەکردنە بۆ دەورانێکی نوێ لە بەمیسۆلۆژیکردنەوەی رۆشنبیریی کۆمەڵگە. پێچەوانەی ئەو ئامانج و بەرژەوەندییە سیاسییانەش دەکەوێتەوە، کە ئەم هۆکارانەی پێنووسراوەتەوەو بۆی نووسراوەتەوە.

ئەویش لەوێوە:

ا.تاڕادەیەکی زۆر "سیاسەتی کوردستانیی" لەبەرامبەر دیاردەی کۆچدا بێئیرادەو نێگەتیف و نادینامیکی کردووە. وەك ئەوەی بڵێت: "ئەوەی لەئەستۆی منە کردوومەو ئەویتر لەسەر قەدەر"!.

یان "ئەوەی روویداوە من لێی بەرپرسیارنیم!، منیش قوربانی ناراستەو هێزەکانی دەرەوەی خۆمم!!".

ب-ریزکردنی ئەم هۆکارە سیاسییانە بەوەو شێوەیە بەلای منەوە، لەگەڕانەوە بۆ خاڵی پێشتر"خاڵی أ". نەك هەر پاساوێکی سیاسی مەعقولە بۆ هەموو ئەوانەی کۆچیان کردووە!، بەڵکو هاندەرێکی سیاسی بەهێزو پڕاوپڕیشە بۆ خەڵکانیدیش، کە دەیانەوێ کۆچبکەن، دەبێت کۆچبکەن.

٢-"سیاسەتی کوردستانیی" لەتەنیا دەسەڵاتی سیاسیدا کورتکردۆتەوەو لەمەشدا هیچ ئاوڕدانەوەیەك نییە بۆ :

ا-هەوڵەکانی بەسیاسی و بەحیزبیکردنی زۆر "کۆمەڵە خەڵك"، کە جگە لە فورسکردنی زیاتری شانی خەڵکی کوردستان، و بە هەدەردانی بەشێکی بەرچاوی داهاتی کوردستان، هیچ خستنەسەرێکیان نە لەڕووی سیاسی، و نە لەهیچ روویەکیتری کۆمەڵگەوە بۆ ئەزموونی کوردستان نیەو هەر هەڵبژاردنەکانی "شارەوانییەکان"ی ئەمساڵی کوردستان بەڵگەی رۆشنی بێناوونیشانبوونی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی ئەمانەیە.

ب-بەسیاسی و بەحیزبیکردن – بەئینتلاق سیاسی و حیزبیکردن – ی دامەزراندن ونیشکردنی کۆمەڵەو سەندیکاو رێکخراوە پیشەیی و جەماوەریی و دیموکراسیەکان، کە پێویستە وەك رەگەزێکی بنچینەی بە مەدەنیبوونی کۆمەڵگە، نەبەسیاسی بکرێن و نە بەحزبی.

ج-ئەو دیموکراسیەی کوردستان، کە تانێستاش جگە لەدیموکراسیەکی سیاسی، لەدیموکراسیەکی حزبەکان، دانەبەزیوەتە ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی. ئاخر دیموکراسی لەدۆخێکی کولتوورگەرایی و میسۆلۆژیگەرایی و ئایدیۆلۆژیگەرایی، رۆچوونێکی ریشەیی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەیی ناکات.

د-ئەو "ئازادی"یەی کوردستان، کە لەگەڵ بێکاری و گەندەڵی نیداری و ئاوارەبوون و هەڵاوارنی گەورەی کۆمەڵایەتی و نزمی ئاستی بژێویی واتایەکی ئەوتۆی بۆ نامێنێتەوە.

٢. هیچ ئاوڕدانەوەیەك نییە بۆ ئەو تێزە سیاسیانەی دیکەی دەرەوەی دەسەڵاتی سیاسی، کە لەهێزدارییەکی بەرچاوی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵن بۆ داکشانی مێژوویی کۆمەڵگە. و ئەندێشەن بۆ سەرلەنوێ بەمیسۆلۆژیاو بەکولتووریکردنەوەی مەعریفەو رۆشنبیری کۆمەڵگە، و کۆمەڵگەیان لەبەردەمی ئەگەری هەردەم ئامادەی شەڕی ناوخۆ داناوە، و بۆسەرگرتنی ئەندێشەکانیان ئامادەی هەموو زەبروزەنگێکی سیاسین.

لەتەوەری هۆکارە ئابوورییەکانیشدا، دیسانەوە "٩" هۆکار ریزکراوە.

کەلەمەشدا جۆرە تێکەڵییەك هەیە لەنێوان بناغەکانی ئەم هۆکارانەو خودی هۆکارەکان، کەپێموایە "٣" هۆکاری یەکەم بناغەمن بۆ هۆکارەکانی دیکە. بۆ روونکردنەوەی ئەمە دەڵێم کەس لەبەر ئەوە کۆچی نەکردووەو ناکات، کە دوو نابلۆقە لەسەر کوردستانە، بەڵکو لە ناکامەکانی ئەم نابلۆقانەوە، کەداهات کۆنترۆڵنەکراوەو نەخشەی گونجاو نییە بۆ سوودوەرگرتنی ....، بەڵکو لەناکامەکانی ئەم کۆنترۆڵنەکردنی نەخشەییەوە، کە "عێراق تەگەرە دەخاتە بەردەم ڕێگای جێبەجێکردنی و باشترسوودوەرگرتن لە بڕیاری ٩٨٦"، بەڵکو لەناکامەکانی ئەم تەگەرەدانانەوە. بۆیە بەڕای من دەبوو ئەو "٣" خاڵەی یەکەم خاڵبەندیی نەکرانایەو وەك سەرەتایەکی تەوەرەکە بنووسرانایەتەوە. واتە بەگشتی دەکرێت ئەم تەوەرەیە لە "٦" هۆکاری ئابووریدا کورتبکرێتەوە، کە پێموایە "٥"هۆکاریان زۆر جەوهەرین و باسکردنیان لەشوێنی خۆیەتی. تاکە هۆکارێك، کەمن تێبینیم هەیە لەسەری هۆکاری ژمارە "٩"یە، کەداتانی بەزیاد دەزانم، چونکە ئەوەك خۆی و نەلەناکامیشیەوە ناکرێت وەك هۆکارێکی دیاردەی کۆچ خاڵبەندی بکرێت. ئەمە لەوانەیە بۆ چەند پارەدارێك هۆکاربێت، بەلام لەئاست گشتییەتی و گەورەیی دیاردەی کۆچ ستەمە ئاوڕی لێبدرێتەوە.

لەتەوەری هۆکارە کۆمەلایەتییەکانیشدا ئەم تێبینییانەم هەیە:

١ـخاڵی دووەم زۆر ئاڵۆزو تەمومژاوییە. نازانم چاکسازی "اصلاح"ی کۆمەلایەتی گەر "سست و لاواز" نەبێت، دەتوانێت چ رۆڵێکی لە لەمپەرکردنی کۆچدا هەبێت؟. ئەمە، ئەم خاڵە لەناسانترین تێڕامانیدا ئەوەیە: کە یان وەها لەکۆچ دەڕوانرێ بەرهەمی لادانێکی کۆمەلایەتییە، یان بۆخۆی لادانێکی کۆمەلایەتییە!. کەپێویستە لەبەرامبەری پەرە بەچاکسازییە کۆمەلایەتییەکان بدرێت!!. لەهەردوو حاڵەتەکەشدا، بەلای منەوە ناهەقییەکی گەورەیە، کەبەرامبەر "کۆچبەر" دەکرێت و

پێناسەیەکە بۆ "کۆچبەر" کە دوورە لەهەر راستییەك و دوورە لەڕێزگرتن و پێشێلنەکردنی کەرامەتی ئینسانیبوونی "کۆچبەر".

٢-خاڵی "٢" هەم زۆر جەریانە تەرحکراوە، بەڵام بەڕای من دەبوو ئەمەیان لەتەوەری هۆکارە سیاسیەکاندا بوایە، یان دروستتر لەتەوەری هۆکارە ئیدارییەکاندا بوایە، چونکە ئەو "پلەوپایە"یەی باسدەکرێ یان حزبی و سیاسیین، یان ئیداری.

-خاڵی "٤"ەم، من لێرەدا لەگەڵ ووشەی "لاوان" نیم و لەبریتی ئەمە "نەوەی نوێ" بەشیاوترو راستتر دەزانم. لەنێوان ئەم دووانەدا جیاوازی گەورە هەیە، "لاوان" دەکرێت وەك "توێژێکی کۆمەڵایەتی" باسبکرێن، کەداخوازییان هەیە، بەڵام "نەوەی نوێ" دارشتنەوەی نوێی هەموو شتەکانی دەوێ و پێیە، کەهەر بەڕاستیش "کۆچ" پرسیارە لەهەموو شتەکان و وەڵامی لەهەموو شتەکانەوە دەوێت. بۆیە لێرەدا ووشەکانی "بایەخدان" "زەمینەی گونجاو" هەست" بەمزیاددەبینم.

ئەگەر مەسەلەکە "رێزنەگرتنە لەکەرامەتی لاوان" لە "هەموو و جیهانبینی نەوەی نوێ". ئەوە لەمە رۆشنبیریەك بەرپرسیارە، کەرۆشنبیری ئێستای کۆمەڵگەی کوردستانە، نەك نەگونجاوی "زەمینە"یەك !!. رۆشنبیریەك، کەدەبێت سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوەو بەسەردەمیی بکرێت.

لەتەوەری هۆکارە ئیدارییەکانیشدا ئەم تێبینییانەم هەیە:

١-خاڵی "١"ەم نازانم ئەوە چ "بەرنامەیە" کە، کەداوادەکرێت "بۆ کۆنترۆڵکردنی سەفەری نایاسایی" لەئێستەی تەنکبوونەوەی سنوورەکانی سەردەمی گلۆبالیزەیشن. ئایا ئەمە زەنگلێدان نییە، بۆ کۆتکردنی ئازادی و داخستنی کۆمەڵگەو بە تۆتالیتاریزمی و دیکتاتۆریکردنەوەی سستمی سیاسی. خەڵکێك لێرە لەبڕیارە کۆمەڵگەییەکان، لەژیانی مادیانە فانتازیای ژیان "بەپەراوێزکراوە"و بۆشکاندنی چوارچێوەکانی "بەپەراوێزبوونی" ئامادەیە هەموو ئەهامەتییەکانی سەفەر بنۆشێ، تۆ ئەو مافەشی

لێزموتدەکەی!. یان بەپەراوێزی مەکەو لەپەراوێزبوون دەربازیبکە، گەر ئەمەت پێناکرێت ماڤ ئەندێشەو خەونەکانی خود دەربازکردنی لەپەراوێزبوون لێداگیرمەکە.

٢-خاڵی "٢"هەم. پێموایە لەم خاڵەدا "دیاردەی کۆچکردن" تەواو بچوك و کورت و بەلۆکاڵیکراوە. کەداوای "بەرنامە" لە "دامودەزگاکانی هەرێم" دەکات بۆ "چارەسەریی" دیاردەی کۆچ!!. پێموایە "دامودەزگاکانی هەرێم" ئەگەر بە "ئیرادەو پۆزەتیڤ و دینامیکیش" بن، تواناکانی بۆ بەرنامەیەکی ئاوها زۆرلۆکاڵی و زۆرسنوورداره.

مەگەر ئەم "دامودەزگایە" بڕیارێکی مەعریفیی و دەزگایەکی مەعریفی بێت بۆ داڕشتنەوەی سەردەمیانەی کۆمەڵگە!!. نووسەر دەبوو بەرلەم ئەندێشەکردنە پرسیاری ئەوەی لابووایە، کە ئایا کۆچ لەبەرامبەر چیداو بۆچی رەوتیگرتووە؟. تواناکانی "ئیدارەی کوردستان" تاکوێی ترازانی "گلۆبالیزەیشن- لۆکاڵیزەیشن"ی جیهان، تاکوێی ئاراستەی گۆڕینی ئەو وەرچەرخانەگەورە جیهانییە بڕدەکات، کەکۆچی کردۆتە گشتیەکی هەموو کۆمەڵگە لۆکاڵیزەمییەکان؟!.

کەکۆچ گوزارشتبێت لەدۆخێکی لۆکاڵی ئەندێشەکانی بەکولتووریکردنەوەو بەمیسۆلۆژیکردنەوەی کۆمەڵگە، لەشوێنکاتێکی کۆمەڵگەیی، هاتنەوەمەیدان و بەریەککەوتن و شەڕکردنی کۆمەڵایەتییانەی هەموو تیزە پێشمۆدێرنیتەو پێشگلۆبالیزەیشنەکانی "خودشوناسکردنەوە"، گوزارشت بێت لەمێژوونووسینەوەی بەرەو داکشاندنی کۆمەڵگە لەلایەن ئەم تێزانەوە. دەبێت "دامودەزگاکانی هەرێم"، چ توانایەکی هەبێت بۆ تێپەڕینی قەیرانەکانی لۆکاڵیزەبوونی کۆمەڵگە؟!. بۆیە پێموایە ئەم "خاڵە" جگە لە ئەندێشەیەکی لۆکاڵی ناکاراو بان- واقیعی شتێکیتر نیە.

٣ خاڵی "٦"ەم بەزیادو ناکارا دەزانم، چونکە نەك هەر میکانیزمێك ناتوانێت هەبێت بۆ کۆنترۆڵکردنی تەکنۆلۆژیای گەیاندن!. بەڵکو

نیجرانێکی ناوەهاش جگە لەهەموڵێکی ناشارستانی بۆ بێبەشکردنی کەسوکاری کۆچبەر لەو کۆمەکە ماددیەی کەکۆچبەر دەیانکات. شتێکیتر نابێت، کە لەباشترین حاڵەتی پراکتیزەکردنیشدا پینەکردنی پۆشاکە کۆنەکە دەبێت، نەك گۆڕین و تازەکردنەوەی!.

٤-خاڵی "٨" زۆر زیادەیە، چونکە ستەمە کۆچبەرێك بدۆزیتەوە بڵێت بۆیە "کۆچ"م کردووە "دەرماڵەم پێنەدراوە"!!.

٥-خاڵی "١١" بەو شێوە داڕشتنەی راستە هەیە، بەڵام نابێتە هۆکاری کۆچ. بۆیە دەبوو ووشەی "هاندان" لەسەرەتای ئەم داڕشتنەدا هەبووایە.

هەر "٥"خاڵەکەی "تەوەری رۆشنبیری" تێڕوانینێکە" کە "کۆچبەر" وەها پێناسەدەکات کەسێکە "کۆچ"ی لەهەموو پابەندیە "نیشتمانی"و نەتەوەییەکان و لە "بەها" "رەسەن" و "پیرۆزەکان"ی کۆمەڵگەی کوردستان کردووەو لەمانە هەڵگەڕاوەتەوە!!. من بەووردی لەنووسینێکدا لەسەر ئەم جۆرە تێڕوانینە راوەستام و نامەوێت لێرەدا زۆری لەسەر بنووسم. تەنیا دەڵێم ئەمە پێناسەیەکی، زۆر هەڵەی "کۆچبەر"ە، چونکە پابەندنەبوون بەو "شتانە"ی پەیوەست نیە بەبڕینی سنوری جوگرافی نیشتمان، خەڵك هەیە، زۆریشن و رێکخراویشن، ئەم سنورەشیان نەبەزاندووەو کۆچیان لەپابەندبوون بەو شتانە کردووەو خەڵکیش هەنە، زۆریشن، ئەم سنوورەشیان بەزاندووەو لەنێستەی خەڵکی ناوسنوور کەمترنین لەپابەندیان بەو "شتانەوە".

من لێرەدا، کۆتایی بەم تێبینییانەم دەهێنم و لەگەڵ دەستخۆشیم بۆ ئەم دەستپێشخەریەی پەرلەمان، بۆ راوەستان لەسەر پرسی کۆچ، هەموو ئەم تێبینی و پێشنیازو روونکردنەوانەم بۆ دەوڵەمەندکردن و کاراکردنی ئەم دەستپێشخەریە بەنرخەی پەرلەمانی کوردستانە.

تێبینی:- ئەم باسە لە گۆڤاری گوڵان ژمارەکانی "٢٣٧ – ٢٤٠" بڵاوبۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی مقەستیش لەبڵاوکردنەوەی بەکارهاتووە، بەڵام وەك خۆی و وەك ئەوەی بڵاوبۆتەوە لەم پاشکۆیەدا دەینووسمەوە.

## فەهرەست


* پێشەکی 5
* بەشی یەکەم 9
* بەشی دووەم 21
* بەشی سێیەم 26
* بەشی چوارەم 47
* بەشی پێنجەم 75
* بەشی شەشەم 94
* سەرچاوەکان 106
* پاشکۆکان 118
* پاشکۆی یەکەم 119
* پاشکۆی دووەم 125